﴿ انا لله و انا الیه راجعون ﴾

بەداخ و کەسەرێکی زۆرەوە لەکاتێکدا گۆڤاری سروەی ژمارە ٦٠ دەچووە ژێر چاپ، هەواڵی دڵتەزێنی کۆچی دوایی مامۆستای نورانی و پایەبەرز، سەید تاهیری هاشمی مان بەدەست گەیشت کە هەمووانی نوقمی غەم و ماتەم و پەژارە کرد. هێشتا تەم و مژی پەژارەی لەدەستدانی مامۆستا هەژارمان لە ئاسۆی دڵ نەڕەویبوو کە ئەم هەواڵە دڵتەزێنە وەک بوومەلەرزەیەک رایتەکاندین و شیوەنی نوێ کردینەوە.

**سەید تاهیری هاشمی** هەڵکەوتەیەکی گەورەی دنیای عیرفان و وێژەوانی بوو. بۆ فەرهەنگی کورد جێگەی شانازی بوو، وەک فریشتەی نوور کۆمەڵگای خۆی رووناک کردبۆوە، دۆستی سروە بوو، پاڵپشتی گەورەمان بوو. هانی دەداین بۆ خزمەتی گەورەتر. بەڵام داخ و دەرد ئەوا چەپکەردی گەردوون ئەویشی لێ ئەستاندین و دیسان کوێستان کەوت و تەنیا ماینەوە. بەپێی هەواڵی گەیشتوو مامۆستا رۆژی ٢،٤،٧٠ یانی دەرۆژی پیرۆز و پاکی جەژنی قوربان دا لە نەخۆشخانەی دوکتور بەهەشتی گیانی پاکی بەرەو مەلەکووتی ئەعلا فڕی و رۆژی ٣،٤،٧٠ بە شکۆیەکی تایبەتی یەوە دەگەڵ پێشوازی و بەڕێکردنی جەماوەرێکی زۆر گەورە لە پایەبەرزانی وڵات وەک ئوستاندار و کاربەدەستانی دەوڵەتی ناوچە و پێشەوا ئایینی یەکان و خەڵکی شار و گوندەکان بەرەو گوندی دەوڵەتاوا کە شوێنی لەدایکبوونی بوو بەڕێ کرا و لە تەنیشت مەرقەدی پاکی باپیرەی، حەزرەتی شێخ رەسوولی حوسێنی بە خاک ئەسپێردرا. قەبری پڕ لە نوور بێ و رووحی شاد بێ. حەزرەتی سەید تاهیری هاشمی پێوەندی یەکی گەرم و بادکانەی دەگەڵ ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کورد هەبوو. بە ناردنی شێعر و نووسین یارمەتی دەداین. رێنوێنی دەکردین و دڵسۆزی خۆی نیشان دەدا. دیاریک بوو لە دامەزرێنەرانی ئەم ناوەندە. تەنانەت دەرۆژانی کۆتایی ژیانیشی داهەر بە سۆز و پەرۆشەوە هاوکاری دەکردین. ئێستا کۆمەڵە شێعرێکی بەلای ئێمەوە هەیە کە خەریکە ئامادەی چاپ و بڵاوبوونەوە دەکرێ. مامۆستای خوالێخۆشبوو سەید تاهیری هاشمی شاعیر، نووسەر، وەرگێڕ، خەت خۆش و عارفی گەورە لەو چەشنە مرۆڤانە بوو کە نموونەیان لە دنیای پڕ تەنگ و چەڵەمەی ئەمڕۆدا زۆر کەمن هەڵدەکەوێ. ئێمە وێڕای سەرەخۆشی لە بنەماڵەی بەڕێزی ئەو خوالێخۆشبووە و هەموو کۆمەڵی کورد بە تایبەتی ئەهلی قەڵەم و فەرهەنگی کوردستان، هیوادارین پاش مەوفاتی ئەو زاتە بتوانین لە ئاسەواری فکری ئەو کەڵک وەربگرین و ئەگەر هەلی دەرفەت هەبێ ئاسەواری بڵاو بکەینەوە. خودا یاری بێ.

﴿ کاربەدەستانی گۆڤاری سروە ﴾

# گازە

خودالێت دەپاڕێمەوە ، ڕێم بدە بگەڕێمەوە ...

دەناڤوڕێ دەکەم وەسەر ، ڕووی خۆم بکەمە کێهەدەر

هەر دەرکێ تۆ پەنای مەیە ، هەر «الله» یە خوداسێ مەیە

محەمەددەت (ص) پێغەمبەرە ، بۆ جن و عینسان ڕابەرە ،

قوڕئانە ڕێی پێشاندەرم ، دەپێناوی دەنێیم سەرم

بەدڵ و گیان پەشیمانم ، تا ڕامێ بخەرە گیانم ،

ڕووت وەرەجاڵ و بێ بەشم ، گوناهبارم ، چارە ڕەشم

هەرچی کردوومە دەیزانی ، لە ئاشکرا ، لە پەنهانی

لە بەزەتمان بێ بەش مەکە ، شەیتانمان پێ خۆش مەکە

لە دنیا و لە قیامەتێ ، ڕەحمێک بە حاڵی ئۆمەتێ

خاڵەمین بەرزەنجی

# نێوەرۆک





ڕووبەرگ: وێنەی خوالێخۆشبوو ماموستا سەیدتاهیرهاشمی



پشت بەرگ: سەرەخۆشی بەبۆنەی کۆچی دوایی ماموستاتاهیرهاشمی


ناو نیشان : ارومیه - انتشارات
صلاح الدین ایوبی صندوق پستی ٧١٧
تلفن ٤٥٧٠٠

تهران - خیابان انقلاب نبش
صبای شمالی - طلبقه‌ء دوم - تلفن
٦٦٠٤٣٣ صندوق پستی




**وێرای سڵاو وئارەزووی بەختەوەری بۆتاکەتاکەی خۆشەویستان !**

دە ژمارەی رابردوودا باسی ئاوارەبوون وهەڵوەدایی چەند میلیۆن کەس لەخوشك و برایانی عێراقیمان هێنایێش ولەوێدا باسی هانەی دوژمنایەتی نێوان عێراق ورۆژاوامان دەشەڕی کەنداوی فارسدا خستە بەرچاو، بەلام باسەکە بەناتەواوی بەجێ‌ماوئێستا لەم ژمارەدا ئەوباسە دەست پێدەکەینەوە وکۆتایی پێ دێنین.

دەژمارەی رابردوودا گوتمان کەپاش ناکام مانەوەی حیزبی بەعس لەشەڕی دژی ئێراندا ئەمریکا وباقی رۆژاوایی یەکان متمانەیان بەرژیمی بەعسی نەما و دەفکرکەوتن کە سیستمێکی سیاسی تازەبۆعێراق دابین بکەن کەبتوانێ دەپێوەندی دەگەڵ ئەوئاڵ وگۆڕە بنەرەتی یانەی شۆرشی ئیسلامی ئێران لەناوچەدا پێکی هێناون قازانج ومەسڵەحەتی رۆژاوا بپارێزێ.

لەلایەکی دیکەوە پاش هێرشی دەسەلاتداری بەعسی وداگیر کردنی کوێت بەکردەوەبارودۆخێك پێك هات کە مەسەلەی ئاڵ وگۆڕ دە داروپەردووی دەسەلاتداری عێراقدا بەشێوەیەکی شێلگیرتر* هاتەگۆڕێ.داگیر- کردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە حاڵ و هەوایەکی تازەی دەنێونەتەوەکانی جیهاندا پێك هێنا. بەشێوەیەك کەرەنگبێ ئاڵ وگۆڕ دەحکوومەتی عێراقدا بۆئێران بەسەرکەوتن دانەندرێ وبەمجۆرە یەکێك لەدوو مۆشکیلەی بنەرەتی رۆژاوا دەپێوەندی لەگەڵ گۆڕانی حکوومەت لەعێراقدا تائەندازەیەکی زۆر حەل کرابوو.

ئەمریکا زۆرترلەترسی ئەوەی کە عێراق ببێتە هێزێکی ناوچەیی بەگژعێراق داچوو. رژیمی بەغدا بە هەویەی رابردوویەوەندیدەتوانی لەباری هێمنایەتی و سیاسی وفەرهەنگی وئابووری بەوە خەونەکانی رۆژاوا- وەدی بێنێ. لەئاکامدا سەرهەڵدانی هێزێکی ئەوتۆکە لەداهاتوودا کەس نەیدەزانی چ دەکا ولەباری ئیسترا- تژیکەوە کەلکی لێ وەرنەدەگیرا (یا بەلانی کەمەوە دەربەستی بۆئەم کەلك وەرگرتنە نەبوو) بۆرۆژاوایی- یەکان زۆر خۆش نەبوو. ئەوجار ئەوترسەش کە لەوانە بوو عێراق (کەبەهێرش کردنەسەرکوێت لەدنیای عەرەبدا خوێنی خۆی تاڵ کردبوو) لەلایەکیشەوە خەیانەتی بەجیهانی ئیسلام کردبوو( بەهۆی هێرش بردنەسەر کۆماری ئیسلامی ئێران) بەرەوئێران بکشێ و تێ بکۆشێ دۆستایەتی ورەزامەندی ئێران بۆلای خۆی رابکێشێ وتەنانەت ئەودووو لاتە پاڵ وێك بدەن وببنە یەك، زۆر لەدڵی رۆژاواییەکان نیشتبوو.بەتایبەتی کە عێراق بەکردەوە هەڵوێستێکی وەهای گرتەبەر. یانی سەددام کەتائێستا بەنێوی گەورەیی جیهانی عەرەب وناسیۆنالیسمی عەرەبی یەوە هێرشی هێنابووە سەرئێران، ئەوجار کەخۆی و لاتێکی عەرەبی داگیر کردبوو نەیدەتوانی باسی "ناسیۆنالیسمی عەرەبی" بکا. ئەوجار بەجێگەی دروشمی رەگەزپەرستانەی "گەورەیی عەرەبی" عەرەبان لێك هەڵداوێرێ وشێخ و شۆرشگێران لێك جیا دەکاتەوە و لۆمەی شێخ وئەمیری سەر وەرۆژاوادەکا وبە عەرەبە شۆرشگێرەکان هەڵدەڵێ وباسی ئیمان وعەقیدە وبڕوابە ئیسلام دەکا!! و تێدەکۆشێ بناغەی دارزیوی خۆی بەئیسلام ویستی درۆزنانە پتەوکاتەوە! نامە بۆسەرەك کۆماری ئێران دەنێرێ وباسی "خەزای پیرۆز" دێنێتەگۆڕ،بەخۆی هەڵدەڵێ ودەڵێ من پشتگری فەلەستینم وخۆی دەکاتە سەرداری ئیسلام. دەڵێی کەدەشەرە نەفتینەکەی کوێتدا لەکەنداوی فارس بەنوێنەرایەتی لەلایەن هەموو موسوڵمانانەوە چۆتەبەربەرەکانی کفروبێ ئیمانی!!

ئەم هەڵوێستانە هەرچەند هەرگیز بنەمایەکی راستینیان نەبووە وهەروەك دیتمان زۆرزووئاشکرابوو هەمووی درۆودەلەسەیە. بەلام خاوەنرایانی سیاسی بەوناسیاری یەی کەلەسەددامیان هەبوو، پێ یان وابوو ئەوقسانە راست ودروستن. یانی دەقامووسی حیزبی بەعسدا (کەبەشێکە لەفەرهەنگی ملهوڕی) حەقیقەت

گرینگ نیە • ئەوەی گرینگە واقیعیەتە ، بەمجۆرە سەردار وسالاری ئیسلام کەدەستی تا ئانیشکی بەخوێنی سەدان هەزار ئینسان سوورە وتێکە لاوێکە لەپەست تر - ین خووی حەیوانی ، زۆربەئاسانی خۆی دەگەیەنێتە پلەوپایەی بەرێوەبەرایەتی وئیمامەتی ئیسلام! بەمجۆرە دوورلە چاوەڕوانی نەبووکەرژیمی بەعسی بۆ ئەوەی داگیرکردنی کوێت بسەلمێنێ وخۆی بە موسوڵمان لەقەڵەم بدا ، تێ بکۆشێ لەئێران نزیك بێتەوە •

هەرچەند ئەم نزیکی یە بەهۆی دژایەتی زاتی دەنێوان ئێران وعێراقدا هەرگیز نەیدەتوانی وەراست بگەڕێ، بەلام لەروانگەی تاکتیکی یەوە مەیسەردەکرا و هەر ئەوەش بۆ رۆژاوا پڕلە مەترسی بوو • بەتایبەتی کە لەسایەی ئەم نزیکایەتی یە - هەرچەند کاتیش بایە - بەهۆی جیاوازی دووحکومەت لەکروساختمان دا، هەلکەوت وبارستای حورمەتی ناونەتەویی و ••• ئیمکانی ئەوەی عێراق گوێ لەمستی ئێران بێ دە ماملەی نێونەتەوەیی دا زۆربوو • ئەوەش مەترسی بۆ رۆژاواگەلێك تێدابوو • هەرئەوەش بووبەهۆکەئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بەهەمووهێزێکەوە دە شەری کەنداودا بەگژ عێراقدا بچن • رۆژاواو ئەمریکا و کەلك* وتوورەکانیان یکپارچە ویەك دەنگ دەوشەرەدا بەشداری یان کرد • تائەوجێگایەی کەیەکی وەك سەرەك وەزیرانی ئینگلیس ئەو یەك بیرورایی وزوودەست بە کار بوونە یەشتێکی سەرنج راکێش وبێ وێنە دەزانێ •

بەهەرحاڵ شەڕدەستی پێکرد وبەکردەوە ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی پێش لەوەی دەفکری وەدەرنانی عێراق لەکوێت بن زۆرترلەسەر ئەوە پێداگربوون کە هەموو توانای نیزامی وئابووری عێراق لەناوبەرن• زۆربوونی بارستای هێزی دەکارکراو وچا لاکی بێ سابیقەی ئەمریکا نیشان دەدا کە ئەمریکا هەرنەك دەیەوێ برست و تاقەتی نیزامی عێراق لەناوبەرێ بەڵکوو دەیەوێ ئەم وڵاتە بۆهەتاهەتابێ هێزبکاودەیەوێ ئەم وڵاتە کەداهاتووی سیاسی روون نیە بەخۆیەوە هەڵپەسێرێ• دەوراستایەدا بڕیارنامەکانی شووڕای ئەمنیەنیش زۆرسەرنج راکێشن • چونکە ئەم بڕیارانە تەنیا بۆ ئەوەنین کەعێراق لەکوێت بکشێتەوە • بەڵکوو بەدەبەرچاوگرتنی داهاتووی عێراق بڕیار دراوە کە لێرەدا ئێمە لەبەردرێژە پەیدانەکردنی وتار چاوپۆشی لێدەکەین •

سەرئەنجام ئەمریکاو هێزە هاوپەیمانەکانی توانیان هێزە عێراقی یەکان لەکوێت رەپاڵ* نێن•بەلام چونکە ئامانج لەوە هەورازتربوو ،ئەمریکا بە دەرکەوتنی عێراق لەکوێت دانەسەکنا وهێندێکیشی لە خاکی عێراق داگیرکرد • دەپێشداواچاوە ڕوان دەکرا کە ئەم کارە بۆسەرەوبن کردنی دیکتاتۆری عێراق بەرێوەدەچێ بەلام زۆری پێ نەچوو کەراستی دەرکەوت وروون بۆوە کەئەمریکا بەپێچەوانەی تەبلیغاتی ئاشکرا ، نایەوێ سەددام سەرەوبن کا چونکە جێگر (ئالترناتیو) ێکی باشی بۆجێگەی سەددام بەدەستەوە نیە • بێجگە لەوەش ئەوانەی دەیانهەوێ دەسەلاتی داهاتوو بەدەستەوبگرن لەبەربیروڕای مسولمانانە و هاودەنگی دەگەڵ ئێران دەیانتوانی زۆر مەترسیهێنەر بن• لەبەرئەوە ئەمریکا رایگەیاند هەرچەند دەیەوێ خەڵکی عێراق سەددام لەگۆرێ لابەرن بەلام نایەوێ دەکاروباری ناوخۆی عێراقدا دەست درێژی بکاوخەڵکی عێراق دەبێ خۆیان بۆچارەسەرکردنی چارەنووسی خۆیان دەست بەکاربن•(1) لێکدانەوە وبۆچوونی هەڵەی ئەمریکا لەبارودۆخی ناوخۆی عێراق بووبە هۆکەلەسەر ئەم بڕیارە زۆر ترپی دابگرێ ولە خەڵکی عێراق داوابکا بۆتێکرووخاندنی رژیمی بەعس هەستنە سەرپا •کاتێك خەڵکی عێراق( کە لەچەنگ جەوروستەمی رژیمی عێراق وەگیان هاتبوون ) بۆتێك شکاندنی سەددام هەستانە سەرپا ، یانی دروست کاتێك کەئەم شۆرشە گەرم و شێلگیرانەبوو ، ئەمریکا ئیزنی دابەسەددام( تەنانەت داوای لێکرد ) کەدوژمنانی خۆی سەرکوت بکا •بەمجۆرە لەحالێکدا چی وای نەمابوو خەڵکی موسوڵمان و زۆرلێکراوی باکوور وباشوور بنەمای زوڵم وزۆرتێك - برووخێنن وکوندەبووی شوومی بەعسی لەعێراق دەرپەڕێنن ، دەبینین کەدیسان ملهوڕی جیهانی ولە سەرووی هەموان ئەمریکای دنیاخۆر بەپشتیوانی کردن لەزوڵم وزۆر وزاڵم و چەوسێنەر دەبنەکۆسپی رێگای ئازادی وعەداڵەت ورێگا وجێگابۆ زوڵم وستەمی زۆرتر خۆش دەکەن •ستەمێك کەبەراستی رووی مێژووی

رەش کرد ،بووبەهۆی ئاوارەیی و قەتلْ وعامی دەیان هەزار ئینسانی بێ سووچ وتاوان کەبەراستی باسکردنی دژوارە.

ئەوەی کەلێمان سوورە ئەوەیە کەزولّم وستەم نامێنێ وسەدامیش کلکە* لەقەیەتی ودەروا. ئەوەش سوورەکە ئەمریکا سەددامی ناوێ وبێگومان لەمۆرەیەکی باشتر دەگەڕێ. ئەوەیەکە خەلّك وهێزە شۆرشگێرەکان دەبێ بەوشیاری وبێداری پێویست نەهێلْن ئەمریکا - ئەم سەرچاوەی فەسادە - دەئالْ وگۆرپێدانی دەسەلاتد - اری عێراقدا نیەتی خۆی دەکاربێنێ.

---

۱ ـ دەست و پێوەندەکانی ئاکاداری ئەمریکا لە پێشداش دە لێکدانەوەی ئیمکانی روودانی شۆرش دە ئێراندا بە هەلە چوو بوون. دام و دەزگای "سیا" لە سالّی ۵۷ دا چەند مانگ پێش سەرکەوتنی شۆرش ، دە راپۆرتیخۆیاندا رایانگەیاند بوو کە دەسەلاتداری شا یتەوە و قەیرانی پێکهاتوو لە ئێراندا ئەوەندە بە هێز نیە کە دام و دەزگای تێك بڕووخێنێ.

ئەگەر ماکەی دژ بە مرۆڤایەتی ئەمریکا دەبەر چاو بگرین ئەو ئیمکانەش قوت دەبێتەوە کە ئەمریکا خۆی زەمینەی بۆ ئەو نارەزامەندی یەگشتی یە پێك هێنابێ تا دژ بە رژێمەکان بێنە مەیدان و بناسرێن و پاشان ئیزنی بە سەددام دا تا سەرکوتیان بکا و هێزی ئالْ و گۆڕ پێدانی دارو بەردووی سیاسی عێراق لەواندا کز بێو بەمجۆرە داهاتووی سەرکەوتنی رژژیما لە عێراقدا باشتر دابین بکا.




**با سلام و آرزوی سعادت و سلامت برای یکایک شما عزیزان!**

در دو شماره، گذشته در موضوع آوارگی میلیونها نفر از برادران و خواهران عراقیمان بحثی را آغاز کردیم و طی آن در شماره، قبلی در باب انگیزه خصومتی که بین عراق و غرب در ماجرای جنگ در خلیج فارس پدید آمد ، مختصرا " به بحث پرداختیم که البته ناتمام ماند. در این شماره همان موضوع را پی گرفته و مطلب را بپایان میبریم.

درشماره گذشتەدیدیم کەازسویی آمریکا وهم پیمانان غربیش کارحکومت صدام درعراق راپس ازناموفق ماندن حزب بعث دردستیابی بەاهداف ازپیش تعیین شده در جنگ باایران،پایان یافتەدیدەوبدین ترتیب در اندیشه سیستم سیاسی جدیدی برای عراق بودند . سیستمی کەباتوجه بەتغییرات بنیانی در مواضع و ساختار سیاسی ایران(بعدازانقلاب) بتواندمنافع استراتژیك ودرازمدت غرب را تامین نماید .

از سوی دیگر پس از تهاجم حکومت بعثیواشغال کویت و ادعای الحاق این کشور به عراق عملا" شرایطی پدید آمد تامسئله تغییر در ساختار حکومتی عراق به صورت جدی تری مطرح گردد. اشغال کویت توسط عراق فضای جدیدی را درعرصه بین‌المللی ایجادکرد ، بگونه‌ای که شاید دیگر تغییر در حکومت عراق یك پیروزی برای ایران محسوب نگردد و بدین ترتیب یکی از دومشکل اساسی غرب درارابطەبا تغییر حکومت در عراق تا حدودی حل شده بنظر میرسد .

احساس ضرورت آمریکا برای برخورد با اشغال کویت توسط عراق عمدتا " بدلیل ترس از تبدیل شدن عراق به کانون قدرت منطقه‌ای بود. رژیمی که در صورت حفظ ماهیت قبلی ، بصورت بلند مدت نمیتوانست حامل بارهای امنیتی ، سیاسی ، فرهنگی و اقتصادی رویای غربیها برای خلیج باشد و در نتیجه پدید آمدن قدرتی با آینده ای نامعلوم و فاقد قابلیت بهرەبرداری استراتژیك ( و یا اقلا" عدم تضمین لازم برای این بهرەبرداری ) برای غربیها ناخوشایند مینمود . و وقتی این احتمال کەممکن است مخدوش شدن چهره، عراق در جهان غرب (بدلیل اشغال کشور عربیکویت ) از یکسووسابقه، خیانتش بەجهان اسلام(بخاطر آغاز

جنگ و تجاوز به کشور اسلامی ایران ) موجب گرایش حکومت عراق به جلب رضایت و دوستی ایران و احیانا " نزدیکی و اتفاق عملی بین دو کشور گردد مطرح میشود، طبیعی است که مسئله را از حد یک موضوع ناخوشایند فراتر برده و به امر خطرناکی مبدل سازد. خصوصا " اینکه عراق نیز در عمل چنین موضعی را اتخاذ کرد. یعنی صدامی که سیاستهای تجاوز طلبانه‌اش در جنگ با ایران را از موضع ناسیونالیسم عربی و سیادت اعراب توجیه میکرد، با اشغال یک کشور عربی، دیگر نمیتوانست مدعی اندیشه " عربیت " باشد. از این رو بجای طرح شعار نژاد پرستانه "سیادت اعراب" به تفکیک بین اعراب پرداخته و با حمله به شیوخ و وابسته به غرب از باصطلاح " اعراب انقلابی " یاد میکند و با اظهار ایمان و علاقه! و پایبندی! به اسلام سعی مینماید با دست و پاکردن موقعیت جدید اسلامی برای خود آن را جایگزین موقعیت متزلزل عربی نماید. به رئیس جمهوری ایران نامه مینویسد و حرف از جهاد مقدس و رویاروئی عظیم میزند، مدعی شماره یک دفاع از فلسطین میشود، خود را سردار اسلام معرفی میکند. گویی که در جنگ خلیج فارس و نفت بنمایندگی از تمامیت اسلام !! به مصاف کفر میرود و ....

این مواضع اگر چه هرگز حقیقت نداشته است، چنانکه غیر حقیقی بودن آن نیز خیلی زود معلوم شد، لکن صاحبنظران سیاسی با توجه به شناختی که از صدام و حزب بعث وجود داشت، بعنوان یک واقعیت ممکن به آن مینگریستند. یعنی در قاموس - حزب بعث ( بمثابه بخشی از فرهنگ استکباری ) حقایق مهم نیستند، آنچه مهم است واقعیت است و بدین سان آقا و سالار و حاکم بلا منازع اعراب، که دستش تا مرفق به خون صدها هزار انسان بیگناه آلوده است و هویت پلیدش ترکیبی از پست ترین صفات حیوانی است، براحتی خود را تا مرز امامت جهان اسلام بالا میبرد! بدین ترتیب دور از انتظار نبود که رژیم بعثی بخاطر توجیه اقدامش در اشغال کویت و جا انداختن چهره اسلامی خود، سعی نماید به ایران نزدیک شود.

اگر چه این نزدیکی بدلیل تضاد ماهیتی بین ایران و عراق هرگز نمیتوانست جنبه حقیقی بیابد، لکن از نقطه نظر تاکتیکی میسر بنظر میرسید و همین امر برای غرب خطرناک بود. بویژه آنکه در سایه این نزدیکی - هر چند موقت - بدلیل تفاوت - های دو حکومت در ماهیت و ساختار، موقعیت مردمی، میزان نفوذ بین المللی و ... احتمال تاثیر پذیری قابل توجه عراق از ایران در معادلات - سیاسی و موضعگیریها بطور قوی وجود داشت و از این جهت خطر برای استکبار و فوق العاده مهم و حیاتی بحساب می آمد و همین مطلب روح اصلی دلایلی بود که بواسطه آنها آمریکا، متحدین و هم پیمانانش را قانع کرد تا با همه امکانات وی را در نبرد خلیج یاری دهند. بدین ترتیب شاهد اتفاق و اتحاد کم نظیر کشورهای بزرگ دنیا ( و اقمار و وابستگانشان ) در برخورد قاطع و محکم با عراق میشویم، بگونه‌ایکه بسیاری از صاحبنظران از جمله نخست وزیر وقت انگلیس این وحدت نظر و سرعت در تصمیمگیری و عمل را بی‌سابقه توصیف کردند.

بهر حال جنگ آغاز شد و در عمل آمریکا و متحدینش پیش از آنکه بفکر خارج ساختن رژیم صدام از کویت باشند، در اندیشه نابود کردن همه توان نظامی و اقتصادی عراق بودند. اقدامات بی سابقه نظامی و حجم غیر قابل تصور آن بخوبی این واقعیت را اثبات میکند که آمریکا نه فقط در پی نابودی توان نظامی و بالفعل عراق بوده است، بلکه استراتژی انهدام توانایی های بالقوه این کشور را تعقیب میکند: با این هدف که با توجه به ابهامات موجود در آینده سیاسی عراق، این کشور را برای دهها سال فاقد تحرکات مستقل سیاسی و نظامی نموده و در موضع کشوری متکی و وابسته به خود با متحدین غربیش در آورد. در این جهت قطعنامه‌های مصوبه شورای امنیت نیز بسیار قابل توجه است. زیرا این مصوبات تنها متوجه خروج عراق از کویت نبوده است بلکه با ملاحظه آینده،

عراق به تصویب رسیده است.
که در اینجا از پرداختن به جزئیات آن بدلیل پرهیز از اطاله، کلام صرف نظر میکنیم.

سر انجام آمریکا و نیروهای متحدین توانستند نیروهای عراقی را وادار به خروج از کویت نمایند و بدینترتیب ، عملا" هدف اعلام شده، آمریکا از حضور نظامی در خلیج فارس تحقق یافت : اما از آنجا که در واقع هدف فراتر از اینها بود، آمریکا به خروج عراق از کویت بسنده نکرد. و با تعقیب نیروهای عراقی ، از مرز گذشته و بخشی از خاک عراق را به تصرف در آورد . در ابتدا بنظر میرسید ، این اقدام که تحت عنوان حذف احتمال حمله مجدد عراق به کویت توجیه شد، در راستای براندازی دیکتاتور بغداد باشد، اما دیری نپائید که حقیقت امر روشن شد و معلوم گردید که آمریکا خلاف تبلیغات آشکارش ، در صدد سقوط حکومت صدام نیست زیرا آلترناتیو مناسبی برای آینده، عراق در دست ندارد مضافا" اینکه مدعیان جانشینی و حکومت آینده بدلیل گرایشات مذهبی و اسلامگرایی بطور بالقوه- وبدلیل همسوئی با ایران- میتوانند بسیار خطرناک باشند. از اینرو آمریکا به سبب عدم تمایل واقعی نسبت به تغییر حکومت در عراق از یکسو و حضور نظامیش در عراق از سوی دیگر ، اعلام کرد که علیرغم علاقه به سقوط حکومت صدام ، قصد دخالت در حکومت عراق را ندارد و این مردم عراقند که باید نسبت به تعیین سرنوشت خود اقدام نمایند . تحلیل غلط آمریکا از وضعیت داخلی عراق[1] موجب شد تا در اتخاذ این موضع- که شاید تنها راه مناسب بنظر میرسید- قطعیت بیش از حد نشان داده و از مردم عراق بخواهند تا برای سرنگونی حکومت صدام بپاخیزند و وقتی مردم (که جانشان از ستمهای حکومت بعثی به لب رسیده بود) برای سرنگونی صدام بپاخاستند ، یعنی درست زمانی که این قیام مردمی بسیار جدی و موثر دیده شد ، آمریکا به صدام اجازه داد (و بلکه از وی خواست ) تا مخالفین خود را سرکوب نماید

و بدین ترتیب در حالیکه میرفت تا مردم مسلمان و مظلوم عراق در شمال و جنوب پایه های ظلمتکده، صدام را فرو ریزند و بهزندگی ننگین جغدان شومبعثی پایان ببخشند ، دگر باره این استکبار جهانی و در راس آن آمریکای جهانخوار است که بار دیگر با حمایت از ظالم و ستمکر مانع از برقراری عدالت و صلح گردید و زمینه، را برای ستمی بزرگتر و گسترده تر هموار ساخت ، ستمی که به حقیقت روی تاریخ را سیاه کرد و قتل عام هزاران انسان بیگناه و آوارگی میلیونها عراقی براستی که قابل وصف نیست.

آنچه کهقطعی و مسلم است، این است که ظلم پایدار نمیماند و صدام رفتنی است . مطمئنا" آمریکا نیز صدام را نخواهد خواست و یقینا" در اندیشه، یافتن و چیدن مهره مناسب است. اینجاست که مردم و نیروهای انقلابی باید با هشیاری و بیداری لازم مانع از اعمال نظر آمریکا - این سرچشمه، فساد در دنیا- در تغییر ساختار حکومت در عراق شوند .

---

۱. عوامل اطلاعاتی آمریکا قبلا" نیز در برآورد احتمال بروز انقلاب در ایران بخطا رفته بودند . سازمان سیا در سال ۵۷ - چند ماه قبل از پیروزی انقلاب" در گزارش اطلاعاتی خود، حکومت شاه را حکومتی برپایههای محکم دانسته و بحران بوجود آمده را در حد تغییر درحکومت ، جدی و خطرناک ندانستند .

با توجه به ماهیت ضد انسانی آمریکا احتمال دیگری نیز داده میشود و آن این است که آمریکا زمینه را برای بروز موج نارضایتی هموار ساخت تا بدین ترتیب مخالفین را بهصحنه کشانده و سپس با باز گذاشتن دست صدام برای سرکوب و وارد کردن ضربه به مخالفین ، توانایی آنهارا برای تغییر در ساختار سیاسی عراق از بین برده یا ضعیف نماید و بدین ترتیب موقعیت آینده، غرب در عراق را بهتر نماید.




## " بەناوی خودا "

## هەواڵێکی فەرهەنگی

لە رۆژەکانی ٢١ و ٢٢ی جۆزەردانی ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی لە لایەن ستادی بەرێوەبەری "یـــنادوارەی ئاوارەکانی عێراقی "یەوە، بۆ ریز کرتن لە ئاوارەکان و هەروەها بایەخ دانان بۆ میوانداری خەڵکی ئێران لــە . لایەك و هەڵسەنگاندنی یارمەتی یەکانی دنیا سەبارەت بەم ئاوارە خۆشەویستانە کۆ بوونەوە و شەوی شێعــر و مۆسیقا لە شاری مەهاباد بەرێوە چوو.

لە شەوی یەکەمی ئەم کۆبوونەوەیەدا بەرێزان دوکتۆر خوررەم مشاوری وەزیری کار و باری دەرەوەی وڵات ، ئوستانداری ئازەربایجانی رۆژاوا ، نوێنەری خەڵکی بۆکان لە مەجلیس و ئیمام جومعەی مەهاباد سوخەنرانیــان کردو پاشان شاعیرانی میوان لە تارانەوە بەرێزان برایـــم ستوودە، کو لشەنی کوردستانی ، حوسێن لاهووتی و بەیتوڵڵا جەعفەری نوێنەری خەڵکی ورمێ لە مەجلیس ، شێعریان خوێندەوە .

لەم بەرنامەیەدا کۆری مۆسیقای وەفایی لە ژێر چاوەدێری کاك رەشید فەیزی نژاد سروودێکی جوان و رێـك و پێکیــان لە بابەت حەڵەبجەوە پێشکەش کرد کە بە تەواوی سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی راکێشا . لەسەرە تادا کۆری مۆسیقا ئاهەنگێکی دەست پێکرد . پاش ماوەیەك بە یەك دوودەنگی بەرز حاڵەتی بۆمبارانیان خوڵقاند و ئینجا چەند ئەکتەرێکی شانۆیی کە لە نێو خەڵکەکەدا دانیشتبوون لە هەموو لایەکی ساڵۆنەکەدا هاوار و رۆرۆیان ساز کرد و بەرە و سەکۆی کۆرەکە وەرێکەوتن و کاتێك کە گەیشتنە سەر سەکۆیەکە بەرلەوەیکە بە یـــەك بکەن، مردن و پــاشان کۆری مۆسیقا لە سەر تەرمی ئەو ژن و مندا ڵانە سروودی حەڵەبجەی خوێندەوە.

لە نێو کۆری مۆسیقادا دوو هونەرمەندی کوردستانی عـــێراق ، سەرتیپ ئەحمەد بە فلووت و عەدنـــان عەبدوڵڵا بە دەنگی خۆش گەرمی یەکی تایبەتی یان بەبەرنامەکەدا .

لە شەوی دووهەمیشدا بەرنامەکە بە شێعر و مۆسیقا درێژەی پێدرا و لە ماوەی شەوی شێعرەکەدا ئــــە و شاعیرانە شێعریان خوێندەوە . ناسر ئاغا برا ، رەسووڵ کەریمی ، سەلاح عەرەبی ، رزکار خۆشناو ، عەلـــی رێبوار ، سەید قادر سیادەت ، رەسووڵ رەش ئەحمەدی ، مارف ئاغایی و خوشکە مێهری پاکزاد .

هەر وەها لە شەوی دووهەمدا پەیامی ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی لە لایەن یەکێك لــە ئەندامانی ناوەندەوە خوێندراوە کە لە ژێرەوە دەقی پەیامەکە پێشکەش دەکەین :

" بــە نـــاوی خـــودا "

وێرای سڵاوێکــی گەرم و گور بۆ بەرێوە بەران و بەشدارانی ئەم کۆر و کۆبوونەوەیە:

لە لایەن ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کورد و هەموو کار بە دەستەکانی یەوە پیرۆزبایـــی ئەو کارە فەرهەنگی یەتان لێ دەکەین و هیواداری کۆ بوونەوەکەتان بە ئامانجە پیرۆزەکانی خۆی بگـــا و

سەرکەوتووبێ • ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کورد لە هەموو کات و لە هەموو شوێنێکدا پێشوازی لە هەڵکرتنی هەر هەنگاوێك دەکا کە بۆن و بەرامەی فەرهەنگی و ئەدەبی و ئینسانی لێ بێ • بە تایبەتی ئەگەر جووڵانەوەی لەم چەشنە پێوەندی بە کورد و ژیانی کورد و مێژوو یا فەرهەنگی کوردەوە هەبێ •

" یادوارەی ئاوارەکانی عێراقی " خۆی لە خۆیدا مانایەکی گرینگی هەیە• ئەو ئاوارە بوونە کشتی یەی گەلی کوردی عێراقمان بێگومان جووڵانەوەیەکی گەورەی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوو کە بۆ ماوەیەکی زۆر هەموو دەنگێکی لە جیهاندا کپ کرد و خۆی بوو بە خرۆشێکی گەورە و دەنگی مەزلوومیەتی کوردی گەیاندە گوێچکەی گوێ ئاخنراوانی عالەم و تەکانێکی گەورەی دا بە جیهان • ئەم ئاوارەیی یە ئیقرار و رەخنەگری - یەکی یەکپارچەی گەلێکی یەککرتوو بوو لە دژی دیکتاتۆری و ملهوڕی و پیاو کوژی رژیمی بەعس و سەرۆکە خوینخۆ رەکەی کەرووی هیتلەر و ئاتیلا و چەنگیزی سپی کردۆتەوە•

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە وڵاتی خۆشەویستمان ئێران وەك دایکێك کە کۆرپەی لە دەست کەوتبێ هەڵاتبێ باوەشی بۆ هەموو ئاوارەکان کردەوە و بە تەواوی تواناوە بە هانایان گەیشت •

ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردیش بە پێی توانا لەو یارمەتی یەدا بەشداری کرد و تا ئێستا بۆ خزمەت بە ئاوارەکانی عێراقی ئەم ئەرکانەی ژێرەوەی بە جێ گەیاندووە•

١ ـ کۆ کردنەوەی یارمەتی نەغدی لە ئەندامانی ناوەند و لەنێو شاری ورمێ و گوندەکانی دەوروبەر•

٢ ـ ناردنی ئەندامانی ناوەند بۆ شارەکانی کوردستانی ئێران بۆ وت و وێژ و پرس و رادەگەڵ خەڵکی ئاوارە بە کشتی و شاعیران ، نووسەران و هونەرمەندانی ئاوارە بە تایبەتی کە هیواداریـن بەم زوانە بەرهەمی ئەو سەفەرە بە شێوەی کتێب یا گۆوارێکی تایبەتی پێشکەش بە هەموو خوێنەرانی بەرێز بکرێ • بەشێك لە نێوەرۆکی ئەو بەرهەمە ئەدەبی یە بریتی یەلەوت ووێژی دوور و درێژ دەگەڵ مامۆستایان : پروفسۆر عێزەدین مستەفا رەسووڵ ، حەسیب قەرەداغی ، ئەحمەد سالار و مەسعوود محەمەد •

٣ ـ پێشکەش کردنی دە هەزار جلد گۆواری سروە لە هەموو ژمارەکان و کۆنگرەنامە بە ئاوارەکانی عێراقی • ئەم دیاری یانە لە لایەن ئینتشاراتەوە بۆ زۆربەی ئۆردووگاکانی کوردستانی ئێران ناردراون •

لە کۆتاییدا هیواداریـن هەل و مەرجێك لەعێراقدا بێتە پێش کە هەموو ئاوارەکانی بەکورد و عەرەبەوە لە شیمال و جنووب بگەڕێنەوە سەرماڵ و حاڵی خۆیان و سێبەری رەشی دیکتاتۆری یان لە سەر نەمێنێ •

" بە هیوای وەها رۆژێك "

# قورئان باشتر بناسین

خەمبار ماژگەیی .

پێم خۆشه برێك به تاریفی قورئان لەگەڵ خوشك و برایانی موسڵمانی کوردم دا بدوێم . چونکه باوەڕمان ، مافمان ، ژینمان ، زانیاریمان ، برایەتیمان ، ئازادیمان ، بەختەوەریمان ، ئاشتیمان ، ژیانی ناو ماڵ و منداڵمان ، خزمەتمان ، دڵ پاکیمان ، کارو مەزرامان ، خوێندن و بار هێنانمان : یەکیەتی و یارمەتیمان ، رێز و حورمەتمان ، گەشه و نەشەی دڵۆ دەروونمان، هەموو بەراشکاوی‌له قورئانەوه سەر چاوه دەکرێ.

**ان هذا القرآن یهدی للتی‌هی اقوم و یبشر المومنین الذین یعلمون الصالحات‌ان لهم اجرا " کبیرا ".**

ئایەتی **۹** سوورەی ئەسرا

« به راستی ئەو قورئانه شارەزادەکا خەڵك بۆ ئەو بیر و باسایەی که له هەموو بەرنا مەو رێبازێك جوانتره و مزکێنی سەر بەرزی و سەرکەوتن دەدا و بەو کەسانه که ئاکاری جوان و خزمەتی چاك ودڵی پاکیان هەیه .»

قورئان و ئەو قسه و کەلامی یەزدانی مەزنی بێ هاوتایه که به جو بسرائیلی ئەمین دا رەوانه کراوه له لایەن خوداوه بۆ پێغەمبەری رێبەر و **خۆشه ویست .**

**قورئان له ساڵی ۵۷۱ میلادی دا له ئەشکەوتی حیرا هەڵکەوتوو له کێوی " جبل النور " به پێی ئایەتی ۴۱ی سوورەی انفال ، ان کنتم امنتم بالله و ما انزلنا علی عبدنا یوم الفرقان یوم التقی الجمعان. قورئان** له حەفدەی رەمەزانی **ساڵی ۵۷۱ دا نازل بووه .**

هەوەڵین سوورەتی‌قورئان سوورەی " **عەلەق**"ه که ئەوەڵەکەی باسی خوێندن و زانیاری و زانست دەکا ئاخرین سوورەتی قورئان سوورەی"نەسر "ه که باسی یارمەتی و سەرکەوتنی بڕوا داران دەکا .

قورئان ۳۰ جزمه و ۱۱۴ سوورەته. سوورەتی‌گەورەی **" بەقەرە "یه که ۲۷۶ ئایەته** و سوورەتی **چووکەی کەوسەره کەسێ ئایەته، باسی شیفاعەت و** نوێژ و قوربانی‌دەکا .

لەو ۱۱۴ سوورەته ۹۲ سوورەتی لەمەککه نازڵ‌بووه ، **و** ۲۲ سوورەتی له مەدینه نازڵ بووه.

سوورەتێکی قورئان " بسم الله الرحمن الرحیم" ی تێدا نییه که پێی دەڵێن سوورەی تەوبه، و سوورەتێکی قورئان دوو " بسم الرحمن الرحیم"ی تێدایه که پێی دەڵێن سوورەتی " نەمل " سوورەته مەککەیەکان زۆر باسی خودا و تاك و تەنیایی ئەوه و رۆژی دوایی و لێ بڕینه وەو به هشت و دۆزەخ و پاداش و دنەدانی خەڵك بۆ رەوشتی بەرز و خووی جوان دەکا .

سوورەته‌مەدەنییەکان باسی عیبادەت و بار هێنان و شێوەی کۆمەڵایەتی‌بڕوا داران دەکا .

قورئانی‌عەزیم ۶۶۶۶ ئایەته و ۷۶۴۴۰ وشەیه و **۳۲۳۶۷۱ پیته .**

**قورئان به زمانی عەرەبی له وڵاتی حیجاز بۆ خۆشەویستی ئێمه نازڵ بووه.**

**۱۴۱۱ ساڵەکه تەربیەتی ئادەمیزاد دەکا و رێگەی راستیمان نیشان دەدا . قورئان ۱۴۱۱ ساڵه وەك دژێکی پتەو دژ بەبێ باوەڕی و زۆرداری و دووڕوویی راوەستاوه.**

**یا ایها النبی جاهد الکفار و المنافقین و اغلظ علیهم و ماویهم جهنم و بئس المصیر .**

**ئایەتی۷۳سوورەی تەوبه**

قورئان به زۆربەی زمانەکانی دونیا تەفسیر کراوه ،

و بۆ دین و ژین و یاسا وپێشکەوتن کەلکی لێ وەرگیراوە
قورئان بۆ لەبەین بردنی بوت پەرەستی و خۆ پەرەستی
و دڵ رەقی و سەرکەشی و نەخوێندەواری هاتووە.

قورئان یاسایەکی رێك وپێك وبنەرەتییە کەدەتوانێ
مافی هەموو نەتەوە جۆرا و جۆرەکان رەش،سپی ،
زەردوسوور دابین بکا و برایانە لە دەوری یەك
کۆیان بکاتەوە و چاکتر بنیانیشی ئەو کەسەیە کە
خزمەت بە خەڵك و عیبادەتی خودای زۆر بێ .

**یا ایها الناس انا خلقناکم من ذکر و انثی وجعلناکم
شعوبا " و قبائل لتعارفوا ان اکرمکم عندالله
اتقاکم ان الله علیم خبیر** : ئایەتی ١٣ سوورەی
"حوجورات"

قورئان پوختە و پاڵاوتەی هەموو دینەکانی
پێش حەزرەتی محەممەد( س . خ ) و دوایین قسە
بێژێکی زۆر گەورە و بە قازانجە بۆ ئەو هەموو پەندە
بەرزانەیکە لە هەزاران ساڵەوە دراوە بە گوێچکەی
ئادەمیزاد دا .

تێشووی رێگای دوور و درێژیان.

قورئان ماموستایەکی دڵسۆزمانەکە هەموو کات
هاوار دەکا ئەی ئادەمیزاد ئەی مسوڵمان چاکە
بکەن خراپەمەکەن ، ئەوە دۆستە ، ئەوە نەیارە ،
ئەوە رەوایە و ئەوە نارەوایە ، ئەوەکوفرەو ئەوەئیسلامە
، ئەوە پێشکەوتنە و ئەوە دواکەوتنە ، ئەوە
قازانجە و ئەوە زەرەرە ، ئەوە خزمەتە و ئەوە خەیا-
نەتە .

قورئان هەموو خوشکان و برایانی بەرێزمان وادار ،
دەکا کە دەست لە فیتنەوفەساد و دووبەرەکی و رەوشتی
ناحەز و ئاکاری ناشیرین هەڵگرن و لە خودا و دین و
خوێندن و خزمەت نزیك ببنەوە .

قورئان نامەیەکی دینی،کۆمەڵایەتی ،ئابووری ،
مێژوویی ، رامیاری ، زانیاری بەو نامەی رەوشت و
ئەخلاق و شێوەژیانی مرۆیە کە دەستوور و باوی
خودا لە هەر دوو جیهان نیشان دەدا و دەلیلی
پێشکەوتن و دوا کەوتن،مردن و زیندوو بوونەوەیکەلان

یا ایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی وجعلناکم شعوباً وقبائل لتعارفوا
ان اکرمکم عندالله اتقاکم ان الله علیم خبیر ئایەتی ١٣ سوورەی حوجورات

قورئان جوانترین و راست ترین تەعبیر و مانایە
لە باسی ئەو ئامۆژگاریانەی کە نووح و ئیبراهیم و
مووسا و عیسا و محەممەد ( علیهم الصلاة و السلام )
فەرموویانە و کردوویانە هەر یەکە بۆ گەلی خۆی

قورئان سەرمەشقە بۆ مسوڵمانان کە هەمیشە
چاوی لێ بکەن و زانستگا و قوتابخانە و مەکتەبێکی
بەرزە تا هەموو رۆژێ دەرسی لێ وەرگرن و لێی
فێرێشت بن.

قورئان کورتەی هەوڵ و تێکۆشانی گشت پێغەمبەران
و پیاو چاکانی جیهانە .

لەگەڵ تاقی کردنەوەی هەزاران ساڵی ئادەمیزادکە
پێشکەشی دەکا بە مسوڵمانان بۆ ئەوەی ببێ بە
پێش چاو دەخا .

بە کورتی و بەکوردی قورئان گەورەترین و چاکترین و
پرنێوەرۆکترین پەرتووکی دونیایە کە ئەگەر بە راستی
باوەرت پێ بێ و عەمەلی بکەی لێهاتووترین تاك و
گەل دەبێ لەجیهاندا .

براکانم خوشکەکانم بەرە و قورئان وەرن بەرە و
قورئان بڕۆین تا لە دنیادا ئەوەندەی دیکە نەدۆڕێین
بەو هیوایە هەموومان لە ژێر سێبەری گیان پەروەری -
قورئاندا بحەسێینەوە و بە ئامانج و ئارەزووی دین و
دونیا عیلم و سەنعەت و بەختەوەری بکەین . هەموو
لایەکتان بە خودا و قورئان و سوننەتی پێغەمبەر
دەسپێرم.

# شیرین لەنێوان هەڵوێستی دووشاعیردا



- حەکیم مەلا سالح -

شیعری (شیرین تەشی دەڕێسێ) لەناو ئەدەبی کوردیدا جێگەی ناوی (وەفایی) گرتۆتەوە. واتە ناوبردنی ئەم شێعرە یەکسەر ناوی شاعیرەکە دیاری ئەکات. پێم وایە وەفایی ئەگەر هەر ئەم شێعرەشی بکەوتایەتە رووبەس بوو بۆئەوەی بەشاعیرێکی هونەرمەند وخاوەن سەلیقە دەست نیشان بکرایە.

بالەوە گەڕێین کەشاعیر لە بارەی هونەری یەوە لەم شێعرە دا چی کردووە وچی نەکردووە ، چونکە باس لەوەنیە ومەبەست ئەوەیە کەسێتی "شیرین" لە روانگەی هەڵوێستی شاعیرەوە دیاری بکەین . ئیتر شیرین ئافرەتێکی دیاری کراوە ، یابەگشتی نموونەی ئافرەتی کوردەواری یە . بەپێی ئەو چیرۆکەی کە سەیدیان لەپێشەکی دیوانەکەی وەفایی داگێراویەتیەوە (١) وای دیاری ئەکات کەشیرین هەبووە ووەفاییش دڵی لەلای بووە. ئەگەر واش نەبێ و بەهەر جۆرێکی تری باسەکەی ئێمە ئەوەیە کە وەفایی بەچ چاوێك سەیری ئافرەتی کردووە.

لە خوێندنەوەی دێڕبەدێڕی شێعرەکەدا وادەرئەکەوێت کە شیرین کەرەسەیەکە بۆ دامرکاندنەوەی کەف و کوڵی جینسی وهیچی تر. دیارە ئەمەش بەکەم سەیر کردنی ئافرەتە ولەگەڵ ئەوراستی یەدا جووت نابێ کە ئافرەت نیوەی کۆمەڵەوپێویستە لەهەموو بارێکەوە هاوشانی پیاومافی هەبێت.

شاعیر بەهیچ جۆرێ نەیویستووە لەبازنەی پیاهەڵدانی شیرین بێتە دەرەوە. هەندێ جاریش ئەو پیاهەڵدانە گەیشتۆتە رادەی زیادەڕەوی ولەسنوور دەرچوون . وەك ئەڵێ:

**شکۆفە واهەڵستێ لەزێروزێو حوبابێ**
**لەکەوسەری بەهەشتی دەروونی پڕکرابێ**
(٢)

یائەڵێ :

**شەمس و قەمەر هەڵاتن دوێنێ بەنوێژی شێوان**
(٣)

ئەڵبەتە ئەم زیادەڕەویە باوی قۆناخی کلاسیکی بووە وبەتەنها تایبەتیش نیە بە شاعیرانی کلاسیکی کوردەوە، بەڵکوو لەشێعری نەتەوەکانی تریشدا دەبینرێ و ئەگەر بمانەوێ ئەوە دیاری بکەین کە ئایا شاعیرانمان لەکۆمەڵی کوردەواری یەوە فێری ئەوە بوون یالەژێر کارتێکردنی گەلانی هاوسێماندا ؟؟

پێم وایە ئەمە لەهەر دووکیانەوەیە ورەنگە یەکەمیشیان زاڵتربێ. چونکە لەناو بەیت وشێعرە فۆلکلۆری یەکاندا بەشێوەیەکی زۆربەرچاو ئەکەوێ . بۆنموونە :

**بالاکەت بەرزە بە قەد چنارێ**
**کێ تەفرەی داوی بەردی لێ بارێ**

یا :

**خاڵێ هاوبان پەنجەی پاتەوە**
**یەزی شەکرە ونەباتەوە**

وابزانم "گۆران" ئەگەر یەکەم شاعیری کورد نەبێ ، دەوڵەمەندترین شاعیری کوردە کە ئەم پیاهەڵدانە لەسنوور بەدەرەی گۆڕیوەتەوە بە پیاهەڵدانی ریالیستی وئەوەش لەشێعرەکانیدا بەشێوەیەکی بەربڵاو خۆی ئەنوێنێ . وەفاییش کەزۆر بەتوندی چمکی رێبازی کلاسیکی گرتووە وبەهیچ جۆرێ نەیویستووە دەست بەرداری ببێ ، مافی خۆی بووە کەبەوشێوەبکا . پیا هەڵدانیش لای وەفایی وبە تایبەتی لەم شێعرەدا لەوە ناترازێن کە شاعیر

حەنۆکەی پێیان هاتووە وتەنانەت هەندێ جار وای دەرخستووە کە ئەتوانین بەپێ لێ هەڵبڕینی دابنێین . وەك ئەڵێ:

**ئیفای حەراحەتی دڵ تەشی نەبوو کەرستی**
**شەبەڕی کاڵی خۆی بووپڕئاوویڕ لەمستی**

**هەتیوی کەللەشەق بوو بە داو وحیلە بەستی**
**لەتاوی هات و چۆیدا بەلێوی خونچە گەستی**
(٤)

ئینجا باهەواری قسەمان بگوازینەوە سەرشێعری "برووسك"ی کاك مارف ئاغایی .

حەزئەکەم پێشەکی ئەوەبەگوێی خوێنەردابچرپێنم کەمارف ئاغایی لەو شاعیرە لاوە هەڵکەوتووانەی ئەم بەشەی کوردستانە کەبە دەست پێکردنێکی چاك هاتووەتە پێشەوە وبەرەو پاشەرۆژێکی رووناك و بەرهەمدار هەنگاو دەنێ .

ئەوەندەی من لەنزیکەوە بیناسم ولەگەڵ هەندێ لە شێعرەکانیدا ژیابم وای بۆئەچم کە ئەگەر زیاترخۆی ماندووبکا ئەتوانێ لەقەڵەمڕەوی شێعری نوێی گەلەکەماندا گۆشەیەك بۆخۆی دیاری بکا ، ئەوشتەی بەر لەهەرچی ڕێگای سەرکەوتنی لەبەردا رۆشن کردۆتەوە ئەوەیەکە پێش لە هاوڕێکانی لەژێرسێبەری زمانی شێعری فارسی دەرچووە . لەم شێعرەیدا وادەردەکەوێ کە مارف ماوەیەکی زۆر شەیدای شێعری (شیرین تەشی دەڕێسێ )ی وەفایی بووە و ڕەنگە جارجاریش لەگەڵ خۆیدا کەوتبێتە مشت ومڕوشێعری کوردی پلەپلە کردبێ وئەم شێعرەی لەریزی شێعرەکانی پلەی یەکەمدا دانابێ وهەرلەگەڵ ژیان وگینگڵەش وای لێکردووە کە ئەو بۆشایی یەی وەفایی پڕی نەکردۆتەوە ئەم بەم شێعرەی تەواوی بکا .بۆشایی یەکەش بریتیەلە دەربڕینی سۆز وخۆشەویستی نیشتمان.

پێم خۆشە بەرلەوەی "شیرین" بکەوێتە تەرازووی هەڵسەنگاندنەوە ، پەنجە بخەمە سەر چەند وشەیەکی ناوشێعرەکە کەپێم وایە راست بەکار نەهێنراوە ، وەچونکە شێعرەکە وەکوو شێعرەکەی وەفایی نەناسراوە چاکتروایە بەرلەوەی رەخنەی برایانەم ئاراستە بکەم شێعرەکە بڵاوبکەمەوە :

"برووسك "

**شیرین ئەی کیژی تەشی ڕێس**
**ئیمڕۆ دەبێ برووسکەیەك دەستەمۆکەی**
**هەموو هەورە گمڕۆکەکان کۆکەیەوە**
**زۆرلەمێژە**
**ئەو وڵاتە بێ بەهارە**
**بەرگی سەوز ناکاتە بەر**
**تەشی بادە**
**برووسکەکەت لەرانی ئاسمان بحشێنەو**
**ریزریز باران**
**وەك داوەبەنی بادراو**
**لە کەلاقی ئەو هەورانە ببارێنە**
**باکیژی تۆرپاوی سروشت**
**بۆبەهاری ساڵی تازە**
**بەرگی سەوز**
**بۆبەژنی ئەوخاکەبچنێ**

■ ■ ■

هەرلەیەکەم دێری ئەم شێعرە دا خوێنەر ئەوەی بۆروون ئەبێتەوە کە مارف ئەم شێعرەی بەرامبەر شێعری (شیرین تەشی دەڕێسێ) نووسیوە . لەناوەرۆکێشدا ناوی دژایەتی کوردنی وەفایی یە وئەم بەپێچەوانەی بیروبۆچوونی وەفایی یەوەسەیری ئافرەت ئەکات . ئەگەر لای وەفایی کەرەسەیەکە بۆرابواردن وخۆشی بەرێ کردن ، ئەوا لای ئەم شتێکی ترە هەروەکوو لە خوێندنەوەی شێعرەکەدا دەبینرێ.

جا ئەوەی جێگەی رەخنە بێ ئەوەیەکە :

١- مارف یەکەم وشە یە (شیرین ) دەم ئەکاتەوە و لەدێری حەوتەمیشدا نووسیویە ( تەشی بادەو) کەواتە پێویست ناکا بڵێ ( شیرین ئەی کیژی تەشی ڕێس) .

لێرەدا سیفەتی (ئەی کیژی تەشی ڕێس) بەزیادە سواری کۆڵی شێعرەکە بووە .

٢- نووسیویە : **هەمووهەورە گمڕۆکەکان کۆکەیەوە**

لێرەدا مەبەست وشەی گەڕۆکە . دیارە هەموو هەورێك ئەگەڕێ ووەستاونیە . کەواتە ئەم سیفەتە لە جێگای خۆیدا نیە و پێم وایە "هەورەسپیەکان"ی بنووسیبایە چاکتربوو( هەوری سپی بارانی پێوەنیە "سروە") .

کاك محەممەدی حەمەباقی لەوشـاعیرەوردانـەیـە کە هەروا بە سەروشەدا تێ ناپەڕێ کەچی ئەمیش وەکـو شتێکی سەیر لەشێعری "شاعیر"دا ئەڵێ:

**کەچی مردن وەك مناڵێـك**
**بکموێتـە بەردەم پڵنگێکی کێـوی**
**ئەیزریکـانـد وئەگـریـا**

دیارە هەمووپڵنگێك کێوی یەوپڵنگی دەستەمۆ و(۵) ئەهلی نەبووە ونیە• کەواتـە ئەوسیفـەتە لەویا جێگـە ناگرێ و(برسی) بنووسیایە گونجاوتربوو• ئەمەحکـە لەوەی کەمناڵ لـە بەردەم پڵنگدا گریان وزریکەی پـێ- نامێنێ ، چونکە یەکسەر دەیخوا•

۳- نووسیویە: **ئەوولاتـە بـێ بـەهـارە•**

(ئەو) لەسەرزمانی زۆربەی کوردی کرمانجی خوارووو ئاماژەیە بۆدوور بەپێچەوانەی (ئەم) کە ئاماژەیەبـۆ نزیك ولە هەندێ ناوچەدا (ئەو) بۆنزیکیش بەکاردێ ، حائەگـەر کاکە مارف ئەمەیانی کردبێ ئەوەنیشانـەی بەئارەزوو زاڵکردنی شێوە ئاحافتنی ناوچەیی پێـوە دیارە ولە جێگەی خۆیدانیەو ئەگەر ئاماژەشی بـە دوورکردبێ ئەوکاتە جێگەی خۆی ئەگرێت کە ئـەم شێعرەی لەدوورەولات نووسیبێ•

۴- وشەی "سەوز" کەلە دووشوێندا بەکاری هێناوە• پێویستە لەکاتی خوێندنەوەیدا لە سەری بوەستی تۆزێ قورس بیخوێنیتەوە، ئەگینا هەروەکوو ئەوەی لەسـەر زمان بەکاری دێنین بەوشێوە لەشێعرەکەدا بیخوێنیتەوە رستەکە لەنگ ئەکات•

* * *

ئینجا بابێینە سەرئەوەی پلەی مرۆڤایەتی "شیـرین" لە روانگەی بیرکردنەوەی مارفەوە دیاری بکەین. مارف کەئەڵێ:

**ئیمرۆ دەبێ برووسکـەیەك دەستەمۆکـەی**

یەکسەر ئەوەمان پێ ئەڵێ کە خۆی فەرمانـدارە و شیرینیش فەرمان پێکراوە• چونکە (دەبێ) بۆفـەرمـان پێکردنەو وبەمەش واهەست ئەکەین کە "شیـریـن" هیچ نازانێ وسەری لەوە دەرناچێ کەلەژیاندا چی بکات وچی نەکات؛ شاعیرحەتی پێ ئەدا وفەرمان ئەکابـە سەریاکەبەوکارە هەڵسێ• دیارە ئائێستەش بـە شێوەیەکی زۆر لەناوکۆمەڵگای ئێمەدا هەروایـە و ئافرەت دەستی دووەمە ولەهەمووکاروبارێکدا پێویستە لەسەرنەحشەی جێ پەنجەی پیاو بجووڵێتەوە• بـەلام

مارف وەك شاعیرێکی پێشکەوتووخواز کەباسەکـەی هێناوەتە پێشـەوە دەبوو لەخەتی خەڵکی رەشۆکـی لای بـدایە•

وابزانم گۆران دەوڵەمەندترین شاعیری کوردەلـە باسی ئافرەتدا . بەلام ئەویش نەیتوانیوە مافی خـۆی بداتێ وتەنانەت زۆرجاریش هەربـەچاوی وەفایـی سەیری کردووە• زۆرجاری تریش کەویستوویە ئەورچەیە بشکێنێ بۆنموونە ئاوای کردووە•

**ئەگەر خوای گەورە بەخشی پێت هەتیوێ پێی بڵێ رۆڵـە**
**لەمن فرمێسکی ویست باوکت لەتۆ داوا ئەکا تۆڵـە**

لێرەداسنووری تێکۆشانی (نێرومێ) لەدووبازنـەدا دیاری ئەکات وبازنەی دووەم هێندەنەسکە کەگـۆران رەحنەیەکی گەورەی ئەکەوێتە سەر• گۆران بەچـاوی خەڵکی رەشۆکی سەیری ئافرەتی کردووە وهیـچ ئەرکێکی پێ نەسپاردووە . دەستەپاچەیی وفرمێسك - رشتن نەبێ•

**من ئەم پێوانە لەم سێ بۆچوونەدا وائەبینم**

۱- وەفایی لەگۆران ومارف سووکترسەیری ئافرەتی کردووە وهەربەوەی زانیوە کە بۆدامرکاندنـەوەی ئارەزووی پیاودروست کراوە•

۲- گۆران بەیەك هەنگاو لەوەفایی ترازاوەوئافرەتی هێناوەتە گۆڕەپانێکەوە کەشان بەشانی پیاو بوەستێ. بەلام قارەمانی تۆلەسێن (نێر) و(مێ) یش هەرگریانـی لەسەربێ•

۳- مارفیش هەنگاوێك لەگۆران ترازاوە ولـەوان پتر رێز ونرخی بۆئافرەت داناوە• بەلام هێشتـا بەداخەوە ئەمیش وەك خۆی نەیتوانیوە راستی یەکـە ئاراستەبکات •کە ئافرەتی هێناوەتە مەیدانەوە بـە ژێردەستەیی هێناویەتی وسێبەری (دەبێ) ی نێـری لەسـەرە•

---

۱- بروانە دیوانی وەفایی (پەرەی (۴۴-۴۶)چاپـی ۱۳۳۲•

۲و۳ و۴- هەمان سەرچاوە•

۵- کوڵەکانی دۆزەخ لاپەرە ۶۳•






# جەفایی

- محەمەد عەلی سەردار -

جەفایی ناوی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ حەمەئەمینی کوڕی شێخ عەبدوڕەحمانی کوڕی شێخ عەبدوڕەحیمی کوڕی شێخ حەیدەری کوڕی شێخ عەزیزی کوڕی شێخ حەیدەری گەورەیە ولە ساداتی عەبابەیلی پشتی هەڵەبجەیە.

جەفایی لە گوندی (کانی کەوە) لە دایك بووە و سەرەتای ژیانی لەوێ بەسەر بردووە، قۆناخەکانی سەرەتای خوێندنیشی لەوێ دەست پێکردووە تاهێندێك گەورەبووە توانای گەڕان و شارە وشاری پەیدا کردووە. ئینجا بەپاسای خوێندن وفەقێتی کەلێ جێگە گەڕاوەو، چووەتە شاری (سنە) وئەوجێگایانە کە خوێندوویەتی تائەنجام لەشاری (مەهاباد) پلەکانی دوایی خوێندنی تەواوکردووە و هەرلەوێ ئیجازەی دەرس وتنەوەی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە بۆمەڵبەندی خۆی وشەش ساڵ لە "ئەحمەد برندە" مەلابووە و دەرسی وتووەتەوە، دوای ئەوە چووەتە (ئەرکسەجاڕ) ودوازدە ساڵیش لەوێ بووە ولەمەدرەسەی شێخ مارفی (ئەرکسەجاڕ) دەرسی وتووەتەوە. دوای ئەوە گەڕاوەتەوە (کانی کەوە) و کۆتایی ژیانی لەوێ بەسەر بردووە و دووساڵ لەوێ ماوەتەوە ئیتر کۆچی دوایی کردووە وبۆ بەکجاری سەری ناوەتەوە ولەگۆڕستانی (کلاوسوور) بە خاك سپێرراوە.

بەڵام نازانرێ لەچ ساڵێکدا لەدایك بووە ولە چ ساڵێکدا کۆچی دوایی کردووە. ئەوەندەیش روونە کە جەفایی لەدوادوایی چەرخی سیازدە و سەرەتای چەرخی چواردەی کۆچیدا ژیاوە.

جگە لەوەی کە شێعرەکانی (جەفایی) بەشێکە لە سامانی کە لەپووری ئەدەبی کوردی. جگە لەوەی سەرچاوەیەکی رووحی پڕلە وشەو زاراوەی رەسەنی کوردی بەو لەکاری فەرهەنگ نووسی وەدەوڵەمەند کردنەوەی زمانی کوردی دا زۆر کاربکەرە. دووبابەخی دیاری لەشێعری ئەم شاعیرەدا جێگە سەرنج وشایانی لێکۆڵینەوەن:

١- ئەگەر ئەم شاعیرە دواشاعیری گۆرانی نەبێ یەکێکە لە دواشاعیرانی ئەم زاراوە و دوای ئەم شاعیری وانەهاتووە. سەرباشێعرەکانی هەر بە شێوەی گۆرانی بن.

٢- ئەم شاعیرە یەکێکە لەوشاعیرانەی ئەچنە ناو قوتابخانەیەکی شێعری کە پێی دەڵێن (قوتابخانەی شێعری مەولەوی) و کاتێ بمانەوێ شوێن پەنجەو نیشکی تەئسیری مەولەوی لەشێعرەکانیدا بدۆزینەوە گەڕانێکی زۆرمان ناوێ وبێ ماندوو بوون نموونەی دیاریمان دەست دەکەوێ. ئەمەیش لەکیانی خۆیدا بۆ لێکۆڵینەوەی قوتابخانەکانی شێعری کوردی بایەخێکی زۆری هەیە.

ئەمەیش چەند نموونە لەتەئسیری (مەولەوی) لە (جەفایی) دا :

١- مەولەوی دەڵێ:

دیدەم چون میقراز بێ شەرتیت تیژ کەرد
دات جەتاشەی وەسڵ جەو پەڕش و یەرد

جەفایی دەڵێ:

وە مەودای میقراز خووی بێ وەفاییت
رشتەی پەیمانت چنی (جەفایی) ت
تاتا تان وپۆپاچات تائەو پەر
وێنەی قەمیچی پاچ پەرچەم و پاپەر

٢- مەولەوی دەڵێ:

جە شووم پڕشووم ئەلحەمد سەرای خەم
جە سەروازی هوون جۆی سەرچەمەی خەم
وەبۆی ئەویا لاوخەت وکوڵم وفەم
سەرو سەوز وکوڵ غونچە بدۆ دەم

جەفایی دەڵێ:

ئاماوە دیان جەنە وکۆس دڵ
تەی دەمدادوم دا دەستەی خونچە کوڵ
ماوەران ئەویاد (جەفایی) خەمبار
ئەم کوڵم وئەو فەم دۆس وەفادار

ئەگەر لەشێعرەکانی (جەفایی) وردببینەوە. دەبینین بابەت و مەبەستەکانی کەمن وبەزۆری دوو لایەنی سەرەکی دەگرنەوە:

١- لایەنی نامە ناردن بۆدۆستان و وەڵامدانەوەی نامەیان. ئەم لایەنە بەشێکی زۆری شێعرەکانی گرتۆتەوە. ئەم لایەنە ئەگەر لاسایی کردنەوەی (مەولەوی) نەبێ. ئەو ئوسلووب وشێوازەی شێعرەکانی پێ نووسراوە لاسایی کردنەوەی (مەولەوی) بەرووی ئێداپڕشنگ ئەداتەوە، ئەنانەت کاتی واهەیە شاعیر بەپێتێکی (مەولەوی) دێنێ وبێ جێی بەستەکانی خۆی دەکاوەك:

خەلاس بیم نەکێج بەحر مەحروومی
پەوکە وێردمەن فەرد (مەعدوومی)
"های وەفەرق دین زامداران تاج تای"
"شەریعەت مەیل لەیلێ رەواج دای"

٢-بابەتی غەرام ودڵداری. هێندێك نموونەی ئەم بابەتەش لە شێعرەکانیدا دەبینرێ ،بەڵام روون نییە بۆ دلبەرێکی دیاری وناسراوی وتوویان هەرویستوویە خۆی لەومەیدانەیش بدا ،یان هەروەك سۆفی مەشرەبێك عیشقی حەقیقی مەبەست بووە.

لووای نەووەهار شادی هام فەردان
کەرمی هەردەی دڵ کرۆی هام فەردان
بێ بەزمی فەزای ساراوبەر هەردان
چێشەن نەی دەمدا پەیمان سەردان
سادەی واچێ پێم هاناهەی مەردان
دمخیلەن ئاتاجە حەسرەت مەردان

جە شوومی چارەی هەناسە سەردان
ئەك چون (جەفایی) وێڵ وسەرگەردان
یەقینەن سەرخێڵ کەردەن بە گەردان
رشتەکەی مەیلش جە دەس دڵ وەردان

کۆچ خەیرش کەرد جەلامان لواش
شێونا ئەزم بەزم قەدیمی مەئواش

ئەڵبەت جەناڵەی دڵان بێزارەن
ئەی سەروەختەدا وەسی تەورتارەن

یاوەقەسەید هەزاران تەر
غەزاڵە کەردەن عەزم ئەی سەفەر

وەرنە دووی دەروون کرۆی ئەوکاران
کەرمەی هەوای دڵ جەرگەی خەمباران

سەموم نەفەس جگەر پڕخاران
پڕکەرد یەکسەر سارا و کۆساران

ج وادەی هەوای سەفاکەردەنەن ؟
کەی وەخت تەشریف وەسەیر بەردەنەن ؟

* * *

چێشەن دڵ ئارۆ سروورێ دارۆ
پێشانیش شادی وەش مەوارۆ

بێدارەن نە خاو خەفەت نەی سەروەخت
بەڵێ شای بەختم ئامان نە سەروەخت

فەلەك وەبێ کەید دەورێ دا پەرێم
شادبیم وەدیدار دڵدارەکەی وێم

دڵ وەحەنە لاوەت نوقڵ نەقڵ یار
تاڵی مەزاتش یەکسەر کەردفیرار

مەزەی مەی مەیلش دەروونم مەس کەرد
بەوەمەستییەوە موانام چەند فەرد :

کێن تاج شاهین ئارۆ بۆنە سەر
کێن یاوان وەکام وەسڵ وەش سەمەر

بڕوانە لاپەڕەی ٦٣



# شاعیر

نووسەر: کارل چاپەک

کارەساتێکی سەرسوڕهێنەر بوو ، سەعاتی چواری بەیانی ، لە شەقامی " ژیتنووی " ، ماشینێك ، پیرێژنێك دەکووژێ و هەڵدێ .

" مس یزلیك " کەلانتەری جەوانی پۆلیس ، دۆزینەوەی ماشێنەکەی وەئەستۆ گرتبووەوە .

" مس یزلیك " رووی لە پاسەوانی ژمارە چواردە کرد و گوتی :

- ئێوە لە سێ سەت میتری کارەساتەکەوە ، بە چاوی خۆتان ئەوەتان بینی کە یەك نەفەر لە عەرزی بڵاو بۆتەوە و ماشێنەکەشتان دیت کە بە لەز و تاو هەڵدێ ... دەی باشە ، ئەو وەختە ، ئێوە چتان کرد ؟

پاسەوان گوتی :

- ئەو وەختە ؟ ! ... وەڵڵا هیچ ... من رام کرد بەرەو ژنە بریندارەکە ، یارمەتی بدەم . " مس یزلیك " بە بۆڵە بۆڵ گوتی :

- دەبوایە لە پێش هەموو کارێ ، ژمارەی ماشێنەکەتان یادداشت بکردایە و دوای ئەوە ئافرەتەکەتان هەڵبگرتایە ... هەر چەند ... منیش بە جێ ئێوە بایەم هەر ئەو کارەی ئێوەم دەکرد کە ، وایە ژمارەی ماشێنەکەشتان چاو لێ نەبووە . زۆر باشە عەلامەتێکی دیکە چی ؟ !

پاسەوان بە شك و دوو دڵی یەوە گوتی :

- پێم وایە ، رەنگی ماشینەکە رەش بوو ، شین نەبوو ... نە ، نەبوو ... سووریش ... نە ، نە ، سووریش نەبوو ... ئاخر قوربان ! دەزانی ؟ .. ماشێنەکە ، پێم وایە رەوغەن* سووزی بوو . لە لوولەی پشتەوەی دووکەڵی دەهات ... ئەوە بوو ، کە لە پشتەوە ، شتێك نەدەبینرا .

وەرگێڕ: جەلال مەلەکشا

" مس یزلیك " بە تووڕەیی یەوە گوتی :

- ئەی خودایە ! ئاخر ئێستا ، من چۆن ئەو ماشێنە بدۆزمەوە . لەم شۆفیر و لەو شۆفیر بپرسم " ئێوە نەبوون ، لە پیرێژنێکتان دا " ... چمان لە دەست دێ ، ها ؟ !

پاسەوان ، شانێکی بۆ هەڵتەکاند ، بەلام بە رێزەوە گوتی :

- قوربان : لە راپۆرتی کارەکەمدا ، ناوی یەك نەفەرم وەك شاهیدی کارەساتەکە نووسیوە ئێستا ، لەو ژوورە دایە ، بەلام ، بەلام پێم وا نیە ، ئەویش لە ئێمە زیاتری لێ بزانێ .

" مس یزلیك " گوتی : بانگی کە بزانم .

شاهید هات و مس یزلیك ، هەر وا کە سەری داخستبوو ، ناو و ناوی فامیل و ناو نیشانی پرسی . شاهید زۆر لە سەر خۆ گوتی :

ـ کڕالیك یان ، خوێندکاری مێکانیك ٠

ـ ئەوڕۆ ، سەعاتی چواری بەیانی ، تۆ شاهید بووی ، خانمی " بەژن ماخاچکۆف " دەگەڵ ماشێن تەسادوفی کرد ؟

ـ بەڵێ قوربان ! ٠٠٠ بە تایبەت د مبێ عەرزتان بکەم ، کە شۆفیرەکە تاوانبار بوو ، ئاخر خۆتان بکەن بە سەر پشك و بفەرموون : لە شەقامەکەدا باڵندەش نەدەفڕی ، دەی باشە ، ئەگەر ، لە سەر چوار ڕێیەکەدا ، نەختێك ماشێنەکەی ڕابگرتایە٠٠٠

" می یزلیك " قسەکەی پێ بڕی و گوتی :

ـ مەودای ئێوە ، هەتا لێکدانەکە ، چەند دەبوو ؟

ـ هەمووی دە هەنگاو ٠٠٠ من و هەواڵەکەم ، لە دووکانی ئابجۆ فرۆشی وەدەرکەوتبووین و من خەریك بووم دەگەڵ هاواڵەکەم ماڵاوایی بکەم، کاتێ لە شەقامی " ژیت نووی " ڕەت دەبووین ٠٠٠

" می یزلیك " دیسان قسەی شاهیدەکەی نیوە چڵ کرد و گوتی :

ـ هاواڵەکەتان کێیە ؟ ئەی چۆن ناوی لە ڕاپۆرتەکەدا نیە ؟

ـ " یارۆسلاونەراد " ی شاعیر قوربان !

بە شانازی یەوە درێژەی بە قسەکەی دا :

ـ شاعیرێکی باشە ٠٠٠ بەڵام تەنانەت جەنابیشت لە شێعرەکانی تێ ناگەی !

ـ بۆ چی ؟

ـ بۆ ئەوە کە ٠٠٠ ئەو شاعیرێکی زگماکییە ، تەنانەت دوێنێ شەوێ ، کاتێ ئەو کارەساتە دڵتەزێنە ڕووی دا ، وەك منداڵ ، بە هەنسك و گریانەوە ، بەرەو ماڵ هەڵات ، بەڵێ ٠٠٠ ئێمە قوربان ٠٠٠ لە شەقامی " ژیت نووی " پیاسەمان دەکرد ، لە پڕ دیتمان ، ئەوا ماشینێك زۆر بە ئالووکە نیزیك دەبێتەوە ٠٠٠

ـ ژمارەکەی ٠٠٠

ـ داوای لێبووردن دەکەم قوربان ٠٠٠ژمارەکەم نەزانی ، من هەر ئاگام لە شاڵاو هێنانی ماشێنەکە بوو و لە لای خۆمەوە بیرم دەکردەوە کە ٠٠٠ ئەها ٠٠٠

" می یزلیك " بۆ چەندمین جار ، قسەکەی لێ دابڕ کرد و گوتی :

ـ سیستمی ماشێنەکە چی بوو ؟

خوێندکاری بەشی میکانیك گوتی :

ـ سیستمەکەشم نەزانی ، بەڵام ماتۆڕەکەی دیزل بوو ٠٠٠ چوار سیلندر قوربان !

ـ ڕەنگی ئوتاغەکەی چی بوو ؟ ٠٠٠ کێی تێدا دانیشتبوو ٠٠٠ کرووکی بوو یا ٠٠٠

خوێندکار بە دوو دڵی یەوە گوتی :

ـ چتان عەرز بکەم ، نازانم ، پێم وایە ڕەش بوو ٠٠٠ بە کشتی ئاگام لێ نەبوو ٠٠٠ چونکە کاتێ ئەو خانمە ، وە عەرزی کەوت، من ئاوڕم بۆ هاواڵەکەم دایەوە و گوتم : بڕوانە ، بڕوانە ج ئینسان گەلێکی بێ ویژدان پەیدا دەبن ، لێیدا و ڕۆیشت و تۆزێکیش گوێی نەدایە ٠

می یزلیك گوتی :

ـ هوم ٠٠٠ ئەڵبەت ئەمە ڕاستە ، بەڵام باشتر ئەوە بوو ، ئێوە بە جێ ئەم قسانە ، ژمارەی ماشێنەکەتان تەماشا بکردایە ٠٠٠ جێی سەرسوڕمانە کە خەڵك بۆ ئەوندە کێژ و کێلن !

قسەی تۆ ڕاستە ، شۆفێرەکە ئینسانێکی بێ ویژدان بووە ، بۆ ئێوەش ئاشکرایە کە تاوانبار بووە ، بەڵام ئێوە ، تەماشایەکی ژمارەی ماشێنەکەتان نەکرد٠ هەموو کەس دەتوانن مەنتیقی بیر بکەنەوە بەڵام کەمتر کەسێ بنەڕەتی بیر دەکاتەوە ٠

سوپاست دەکەم ئاغەی کڕالیك ، ئەمن عەرزێکی دیکەم نیە ٠

سەعاتێك دوای ئەو باس و خواسە، پاسەوانی ژمارەی ١٤١ ، زەنگی دەرکەی ماڵی " یارۆسلاونەراد " ی شاعیری زرەنگاندەوە،خانمی ساحێب ماڵ گوتی :

ـ لە ماڵیدایە ، بەڵام نوستووە ٠

شاعیر ، کە لە خەویان ڕاپەڕاندبوو، بە ترسەوە لە پاسەوانی ڕوانی و لە دڵی خوێدا گوتی :

ـ چم کردووە ؟ !

ماوەیەکی کێشا ، هەتا پاسەوان مەبەستەکەی پێ حاڵی کرد ٠

شاعیری دڕ دۆنگ ، بۆ دڵنیایی زۆرتر گوتی :

- دەبێ هەر لە کەلتابێم ، ئاخر خۆ من هیچم لە بیر نەماوە ، چونکە دوێنێ شەوێ نەختێك ، بەڵێ . . نەختێك .

پاسەوان گوتی :

- بەڵێ ، نەختێك سەر خۆش بوون ... من زۆربەی شاعیرەکان دەناسم ... تکایە لیباس لە بەرکەن ... من چاوەڕوانم !

لە ڕێکادا لە بارەی مەیخانە ، ئەستێرەناسی ژیان و زۆر مەبەستی جۆراجۆر پێکەوە قسەیان کرد و تەنیا شتێکی لێی نەدوان ، سیاسەت بوو !

کاتێ ، هاتە ژوورەکەی " می یزلیك "کەلانتەر لێی پرسی :

- " یارۆسلاونەراد " ی شاعیر تۆیی ؟

- بەڵێ !

- ئێوە شاهید بوون ، دوێنێ شەوێ ، سەعاتی چوار ، خانمی " بەژن ماخاچکۆف "چۆن وەبەر ماشین کەوت ؟

شاعیر هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی : بەڵێ ...

- دەتوانن بڵێین ، چ جۆر ماشینێك بوو ، کرووکی بوو یا نە ... چ ڕەنگێکی هەبوو ، چەند نەفەری تێدا بوو ، بە کورتی ژمارەکەی چەند بوو ؟

شاعیر دوای بیر کردنەوەیەکی زۆر گوتی :

نازانم ، من بایەخ بەم جۆرە شتانە نادەم ، قەت ئەم شتانە سەرنجم ڕاناکێشن !

" می یزلیك " گوتی :

- هەوڵ بدە شتێك وەبیر بێنیتەوە ، قەی ناکا ئەگەر زۆریش گرینگ نەبێ !

نەراد ، بە سەر سوڕمانەوە گوتی :

- ئەوە چ دەڵێی ، خۆ من قەت تەماشای ئەم وردە شتە بێ بایەخانە ناکەم !

" می یزلیك " بە ڕشقەنەوە* گوتی :

- یانێ جەنابت ، هیچت نەدیوە ؟

شاعیر زۆر بە کورتی گوتی :

- چما ، هەڵکەوتێکی کشتی ، شەقامی بێ دەنگ ، درێژ و باریك ، کازیوەی بوومەلێڵ و تاپۆی ژنێك لە سەر چەمەنتوو . !

کتووپڕ لە جێکەی خۆی هەڵبەزی و گوتی :

- ڕاستی ، من لە مەڕ ئەم کارەساتە ، شێعرێکم هۆنیوەتەوە .

گیرفانەکانی پشکنی و لە نێو وردەواڵەی نێو گیرفانەکانیا ، چەند کوتە کاغەزی دەرهێنا ...

- ئەها ... ئەوەتا ... نا ، ئەوەش نیە ... ئا ، ئا ، ئا ! ڕەنکە ئەمە بێ !

" می یزلیك " لە سەر کورسیلەکەی بزووت و بە ئەدەبەوە گوتی :

- بیخوێنەوە بزانم .

شاعیر بە شەرمەوە گوتی ؛

ئەڵبەتە ، ئەمە لە شێعرە باشەکانم نیە ... بەڵام چون حەز ئەکەی ، بۆتی دەخوێنمەوە .

بە دەنگێکی ئاهەنگدارەوە ، دەستی بە خوێندنەوەی ئەو ڕستانە کرد کە لە سەر پاکەتێکی نووسیبوو :

**ڕیزی ماڵەکان**
**لە پشت تۆڕی بەیانەوە**
**زۆر لێڵ و نادیار دەبینران و ...**
**کازیوە ، ئاهەنگێکی لێدەدا**
**ئێمەش ، دە نێو ، ماشێنێکی کوورسیدا ،**
**ڕێکامان دەپێوا**
**بەرەو سەنگاپووری دوورە دەست**
**کوڵی نەژاکاو پشکووتبوو**
**گوڵاڵەی سیس ، دە نێو تۆز و خاك کەوزابوو**
**هەوسێکی خامۆش**
**فەرامۆش و بێ ئیرادە**
**ئاخ ، گەردنی مراوی**
**ئاخ ، مەمکە ...**
**ئاخ ، تەپڵ و چێوی تەپڵ**
**کە ئاهەنگی تراژێدی لێدەدا**
**کە ئاهەنگی تراژێدی لێدەدا**

شاعیر نەختێك بێ دەنگ بوو ، دوایی گوتی : تەواو

" می یزلیك " گوتی :

- داوای لێبوردن دەکەم ، بەڵام مانای ئەمانە چیە ، بەم وشانە دەتەوێ چ بڵێی ؟

- دەتەوێ چ بڵێم ؟ خۆ دیارە دەمەوێ چ بڵێم ...
سەیری ماشێنەکە ... باشی لێ حاڵی نەبووی ؟
" می بزلیك " گوتی :
- وەڵڵا نە ، من لەم وشە و رستانە نەمتوانی نەتیجە بکرم کە " لە سەعاتی چواری رۆژی پازدە ی ژوئیەن دا ، ماشێنی ژمارە فلان و فلان رەنگ ، لە شەقامی " ژیت نووی " دەکەل " بەژن ماخاچکۆف " پیرێژنی چارەرەش ، تەسادوفی کردوە ، برینـدار دەست بە جێ بۆ نەخۆشخانەی شارەوانی نارد راوە و حاڵی باش نیە و لە ژێر چاوەدێری دایە ..."نا ، من لەم قسانە هیچم دەست نەکەوت ، بە تایبەتی تا ئەو جێکایە عەقڵم پێ دەشکێ ، هیچ ئاماژەیەك بە کارەساتەکە ، لەم شێعرەدا ، نەکراوە .
شاعێر ، لە حاڵێکدا نووك لووتی خۆی دەخوراند گوتی :
- بەڵێ ، بەلام ئەم شتانە ، هەموو ، رواڵەتی مەبەستەکەیە ، راستەقینە ، پووچ و کاڵتەیە ، ئاغا ! شێعر راستی یەکی دەروونی یە ، شێعر مەوجوودێکی سەربەستە و لەو دیوی راستی یە رواڵەتەکانەوەیە کە تەنیا لە هەستی شاعێردا دەژی ، ئەمانە وێنە کەل و خەیا لاتێکن کە خوێنەر و بیسەر دەبێ بە کوێ دڵ و کیان بیانبیسێ و بۆ خۆی بیانشوبهێنێ ، تەنیا بەم جۆرەکەسێ ، دەتوانی لە زمانی شێعر بکات .
" می بزلیك " بە سەر سورمانەوە گوتی :
- عەجەب ، عەجەب ، دروست ، دروست ! زۆر باشە ، بیدە بزانم .
شاعێر شێعرەکەی بە دەستی " می بزلیك "ەوە دا .
- سوپاس ، سوپاس ... باشە ، لێرە دەتەوێ چ بڵێی ... گوتووتە :

**رێزی ماڵەکان**

**لە پشت تۆڕی بەیانەوە**

**زۆر لێڵ و نادیار دەبینران**

دەی باشە ، بڵێ بزانم ، بۆ چی رێز ... ها ؟ ئەمەم پێ حاڵی بکە .
شاعێر زۆر لە سەر خۆ گوتی :

- ئاخر لە شەقامی ژیت نووی دا دوو رێزە ماڵ هەیە .
" می بزلیك " بە دوو دڵی یەوە ، سەرێکی راوەشاند و گوتی :
- ا باشە ، چۆن دڵنیا بم ، ئەم شێعرەتان لە سەر شەقامی میللەت نەگوتبێ . شەقامی میللەتیش دوو رێزە ماڵی تێدایە .
شاعیر ، لە حاڵێکا چاوی لێ ورد دەکردەوە گوتی :
- بەلام شەقامی میللەت ، بە قەد شەقامی ژیت نووی ، باریك و درێژ نیە .
" می بزلیك " ، دیسان ، دەستی بە خوێندنەوەی شێعرەکە کرد :

**کازیوە ئاهەنگێکی لێدەدا**

زۆر باشە لێی گەرێ ، با کازیوە ، ئاهەنگی خۆی لێ بدا ... و لەو دوا :

**گوڵی نەزاکاو ، پشکووتبوو**

ببوورە ، لەم بەینەدا ، گوڵی نەزاکاو ، لە کوێوە پەیدا بوو ؟
شاعێر بە بزەیەکی سەرکەوتووانەوە گوتی :

**- بەیان ... رەنگی سووری پێش هەلاتنی رۆژ**

**- ئاخ راستە ، ببوورە ، ببوورە ، پێش گوڵی نەزاکاویش دەڵێ :**

**ئێمەش دە نێو ، ماشینێکی کوورسیدا ، رێگامان دەپێوا**

**بەرەو ، سەنگاپووری دوورە دەست**

شاعێر گوتی :
- نازانم ، رەنگە من ئەو جۆرەم پێ خۆش بووە !
- ماشێنەکە کوورسی بوو ، نا ؟ !
- راستەکەی نازانم ، ئەوەندە توند دەڕۆیی ، دەتکوت ، گەرەکی بوو ، دەست بە جێ بکاتە ئەوپەڕی دنیا .
دنیا .
- عەجەب ، یانێ بکاتە سەنگاپوور ؟ ! ...
بەلام خودایە ! ... بۆ چی سەنگاپوور ؟ !
شاعێر ، شانێکی هەڵتەکاند و گوتی :

- چووزانم ؟ رەنگە بۆ ئەوەی ، لـــــە ویـــــدا مالاییەکان دەژین کە رەنگیان قاوەیی یە !
- مالاییەکان ؟ یانێ چی ؟ ئاخر مالاییەکان ، چ پێوەندی یەکیان بەم مەبەستەوە هەیە ؟
رەنگی ، شاعێر هەڵبزرکا و کوتی :
- پێم وایە ، رەنگی ماشینەکە قاوەیی بوو ، بەڵێ ، بەڵێ ، دڵنیام شتێکی قاوەیی لە وێدا بووە ئەکەمینا ، سەنکاپوور ، لەم شێعرەدا چ دەکا و چۆن پەیدا بووە !
می یزلیك کوتی :
- هێندێ لە شاهیدەکان دەڵێن ، رەنگی ماشینەکە رەش بووە ، هێندێکیش دەڵێن سوور بووە ، یەکێکیش دەڵێ شین بووە · نازانم کامەیان دروستە ؟
شاعیر کوتی : بێ قسە و باس ، قسەی من دروستە ؟
- چما ؟ بە کام بەڵگەوە ؟
- بەو بەڵگەوە ، کە رەنگی قاوەیی ،رەنگێکی سەرنج راکێشە !
" می یزلیك " کوتی :
- دوایی دەڵێ : " کولالەی سیس ، دە نێو تۆز و خاك کەوزا بوو · " مەبەستت لە کولالەی سیس هەر ئەو پیرێژنەیە ؟
- چ بکەم ؟ لە پیرێژنێك زیاتر نەبوو !
- زۆر باشە ، ئەی ئەمە چیە ؟

**" ئاخ ،گەردنی مراوی**

**ئاخ ، تەپڵ ، تەپڵ "**

مانای ئەمانە چیە ؟
شاعێر ، لووتی داژەندە سەر شێعرەکەیدا و کوتی : بزانم ···

**" ئاخ ، گەردنی مراوی**

**ئاخ ، مەمکە ،**

**ئاخ ، تەپڵ ، تەپڵ ، چێوی تەپڵ**

وەڵلا راستەکەی ، خۆشم لێ حاڵی نابم ، رای ئێوە چیە ؟
پۆلیس ، بە پێکەنینەوە کوتی :
- چیتان عەرز بکەم ! منیش دەمەوێ لە ئێوە پرسیار بکەم !



شاعێر ، لە پڕ ،هەستا سەر پێ و کوتی :
- سەبر ! سەبر ! ··· لە وەی کە من ئەم شێعرەم ، بە هەستێکی قووڵەوە نووسیوە دڵنیام · بزانم ئێوە پێتان وا نیە کە عەدەدی دوو ( 2 ) لە گەردنی مراوی دەچێ · 2
میدادێکی هەڵگرت و دە نێو دەفتەری یادداشتی دایرەی پۆلیسیدا ، نووسی :
می یزلیك ، بە خوشحاڵی یەوە کوتی :
- باشە ، کیانەکەم ! ئەی مەمکە چ دەکەیەنێ؟
- مەسەلەکە خەریکە حەل دەبێ ، مەبەست لە مەمکە ژمارەی سێ یە ، مەگەر مەمکە دوو کنجی نیە ··· ها ··· بەم جۆرە ···
بە میدادەکە نووسی : 3
پۆلیس شاکەشکە دەبوو · کوتی :
- دەی ، دەی ، ئێستا ، دێینە سەر تەپڵ و چێوەکانی تەپڵ ·
نەراد ، چۆ نێو فکرەوە و لەم حاڵەدا بۆ خۆی دووپاتەی دەکردەوە :
- تەپڵ و چێوەکانی ، تەپڵ و چێوەکانی ···
لە پڕ ، راپەڕی و کوتی :
- دۆزیمەوە ، دۆزیمەوە ، تەپڵ دەبێ عەدەدی پێنج بێ ، چونکە کەوانەکەی ژێری لە تەپڵ دەچێ ، خەتەکەی سەریشی وەك چێوی تەپڵەکەیە لە سەر کاغەزەکە ، نووسی : 5
" می یزلیك " کوتی :
- بە ئەم حیسابە ، ژمارەی ماشینەکە لە نێو هەستی شاعێرانەی تۆدا بەم جۆرە خولقاوە " دوو سەت و سی و پێنج " یانی : 235

جا ئێستا ، بە جەخت* دەزانی ژمارەی ماشینەکە ، هەر ئەمەیە ؟

نەراد ، بە سەر سوڕمانەوە کوتی :

- ژمارەی ماشین ؟ خۆ عەرزم کردی ، ژمارەی ماشینم نەدیوە ، بەڵام دڵنیام کە شتێك لەوێدا بووە ، ئەگینا من شتی وام پێ ئیلهام نەدەبوو ، بەڵام ئەم رستە جوانترین بەشی شێعرەکەمە بیروڕای ئێوە چییە ؟ !

دوو رۆژ دوای ئەوە " می یرلیك " چوو بۆماڵی شاعیر ، ئەم کەڕەتە ، شاعیر لە خەودانەبوو ، جگە لە مە ، کچێکیش لە ژوورەکەیدا بوو ، شاعیر هەوڵی دەدا شتێك بۆ دانیشتنی " می یرلیك " بدۆزێتەوە ، بەڵام نەیتوانی " می یرلیك " کوتی :

- قەی ناکا ، زەحمەت مەکێشە ، تاوێك دەمەوێ موزاحیمت بم و سوپاست لێ بکەم و بڵێم کە ماشینەکەمان دۆزیەوە و ژمارەکەی هەر ئەو " 255 "ە بوو ،

شاعیر کوتی : ماشین ؟ کام ماشین ؟

" می یرلیك " کوتی : لە بیرتان نییە ؟

**" ئاخ گەردنی مراوی ، ئاخ مەمکە ، ئاخ تەپڵ ، تەپڵ و چێوەکانی تەپڵ کە ئاهەنگی تراژێدییان لێدەدا "** ئێستا وەبیرتان هاتەوە ، سەبارەت بە سەنگاپووریش هەر حەق بە ئێوە بوو ، رەنگی ماشینەکە قاوەیی بوو ،

- بەڵێ ، بەڵێ ! من خۆ عەرزم کردی کە شێعر زایەڵەی راستەقینەکانە لە هەست و دەروونی شاعیردا ،

دەتانەوێ چەند شێعری جوانتان بۆ بخوێنمەوە ؟ من پێم وایە جەنابت زۆر ئاسان دەتوانی لە مانا و کاکڵی شێعرەکانم تێ بگەیی و لێکیان بدەیەوە !!

پۆلس بە پەشۆکاوییەوە کوتی :

- نا ، نا ، نا ، با بمێنێ بۆ جارێکی دیکە ... دیسان ئەگەر تووشی رووداوێکی چەتوون بووین موزاحمتان دەبم ،

دوای ئەم قسە ، زۆر بە پەلە تێی قووچان، تەواو









# وت وویژ لەگەڵ : فەلەکەدین کاکەیی «٢»

عەزیز کەیخوسرەوی

**■ رۆڵی گۆڤاری سروە چۆنە و چ پێشنیار و بۆچوونێکت بۆ گۆڤار و خوێنەرانی هەیە؟**

- ساڵانی ١٩٣٩- ١٩٤٥ ی ، ز لە عێراق گۆڤاری " کەلاوێژ " دەرچوو ، رۆڵێکی گرینگی بینی لە هاندان و بڵاو کردنەوەی خوێندن و نووسین بە کوردی ، جگە لە ئەرکەکانی تر گۆڤاری سروە لە هەل و مەرجێکی تر و بە شێوەیەکی تر دەر دەچێ ، هیوا دارم لە رووی هاندان و فێر کردنی خوێندن و نووسینی کوردییەوە ئەو رۆڵەی " کەلاوێژ " ببینێ و

تا ئێستاش باش بووە ـ هەر بۆیەش ڕێبازی دەستەی نووسەرانی سروە بە پەسەند دەزانم کە لە سەرەتاوە هەوڵیان داوە ڕێنوێنی خوێنەران بکەن و شێوەیەکی دروستی نووسینیان فێر بکەن و لە بواری داهێنان و مەرجی نووسین ئامۆژکاری پێویستیان ئاراستە بکەن ·

لە چاپدانی چەند فۆلکلۆربەشێوەیچیرۆك بۆ منداڵانی کورد کارێکی ئێجگار پیرۆزە، خۆزگا "سروە" پاشکۆیەك یا کۆڤارێکیتایبەتی بۆ منداڵانی هەبا ، بۆ نموونە بە ناوی سروە بۆ منداڵان ·

نازانم ،ئایا سروە ، ناتوانێ دەنگ و باسی هونەری و ئەدەبی جیهانی لەیەك دوو لاپەڕە دا کۆ بکاتەوە ؟ ئەگەر بایەخی زیاتر بدرایا بە تێکنیکی چاپ و زیاتر کردنی لاپەڕەکانیباشتر دەبوو · بە گشتی ( سروە ) خزمەتێکی شایانیئەدەبیکوردیدەکا · ئەگەر خوێنەرانی ، بە تایبەتی لاوان ، بە چاوی فێر بوون بیخوێننەوە بە بێ گومان سوودیلێ وەردەگرن ·

**■ سەر باریئەمەی سەدام بە هەموو شێوەیەك هەوڵی قەلاچۆ کردنی گەلیکورد لە کوردستانی عێراق دەدا و جار جارەش پەرشەیەشێرەشگەیشتووە ، بەلام ڕێگای دەرچوونی ڕۆژنامە و گۆڤاریکوردیداوە، تۆ ئەم دیاردەیە بە چی لێك دەدەیتەوە ؟**

ـ دەربارەیهەل و مەرجیڕۆشنبیریلە عێراقدا ،سێ ڕاستی هەن ، ئەگەر لە بەر چاو بگیرێ ڕەنگە وەلامی ئە و پرسیارە بدەنەوە ·

**یەك:** زمانیکوردی: بە کار هێنانیزمانی کوردی هەمیشە خواست و داخوازی یەکیڕووناکبیرانی کورد بووە، هەر کە دەرفەتێکی بچووکیان بۆلواوە ، کەلکیان لێوەرگرتووە و بە زمانیکوردی نووسیویانە ، ڕۆژنامە و کتێبیان دەرکردەوە ·ڕووناکبیرانیکورد بە گشتی ، دەچنە بەرە و پیریهەر دەسپێشخەرێکەوە بۆ بەکار هێنانیزمانیکوردی ، بەبێگوێدانبەسەردەم و بارو دۆخیزەمانە ·هەر بۆیەش لەسەردەمی پاشایەتی عێراقیش وەلەسەردەمیکۆماری، هیچ نووسەرێك نەهاتووە نەیقۆزنەوە ·

**دوو:** تایبەتمەندییەکیمێژوویی پێك هێنانی دەوڵەتیعێراق، پێش نزیکەی ۷۰ ساڵ وەختێ عێراق بەم سیستمی سنووریەیئەمڕۆ پێك هات، لە پەیماننامە و ڕێکەوتنامەکاندا هاتبوو کە مافەکانی کورد لە عێراقدا بپارێزرێن ، لەوانەش مافی خوێندن و فێر بوون بە زمانیکوردی و بە کار هێنانیان بوو· زۆر لەو مافانە پێشێل کران بەلام کەم و زۆر مافی بە کار هێنانی زمان بە کار دەهات.خوێندن و فێر بوون لە سلەیمانی و چەمچەماڵتا ساڵی ۱۹٥۸ ی ·ز یش مایەوە· ڕۆژنامە و کۆڤاریکوردی دەردەچوون · تاو بە تاوە قەدەغەدەبوون، جارێکیتر دەهاتنەوە· سوور بوونی نووسەرانی کورد، وەك وتمان لە سەر بە کار هێنانی زمان هۆکارێکیگرنگ بوو کە زووبەزوو کۆڤارەکان و کتێبەکان بە کوردیدەربچن · بە درێژایی نزیکەی ۷۰ ـ ساڵ زۆربەی وەخت بلاو کراوەیکوردی کەوتۆتە دەستیخوێنەرانیکورد ·

**سێ:** خەباتی گەلی کوردستانی عێراق، ئەو خەباتە سەختە درێژ خایەنە ،کە یەکێك لە ئامانجەکانی بە کار هێنانیزمانی کوردیو گەشە سەندنی ڕۆشنبیری کوردی بووە· ئەوە بوو لە ساڵی ۱۹۶۹ـ۱۹۷۰ ی· زبەم لاوە ئەو مافە بە پێی قانوون چەسپا ، خوێندن و فێر بوون بە کوردیسەلمێندرا ، هەر چەندە هەمو و ناوچەکانی کوردستانینەگرتەوە، بەلام هەنگاوێکی هەرە گرنگ بوو · تەنیا لە ماوەی ۱۹۷۰ ـ ۱۹۷۴ ی · ز دا ژمارەیەکی زۆر کتێب و کۆڤاریکوردیدەرچوون ، ( ۱۷ کۆڤاریحەوتووانە،مانگانە و وەرزی)

بەو شێوە تا بە ئەمڕۆ، ئەو ڕاستە قینەیە چەسپا ، بوو بە لاسایی کردنەوەیەکی، بەشێك لە سیستمی عێراق و ریشەگە ی" وەك وتمان" دەگەڕێتەوە بۆ دەیان ساڵپێش ·

دیسانەوە دەڵێم: هونەر ، زیاتر بۆ ئەو نووسەر و ڕووناکبیرانە دەگەڕێتەوە، کە تا ئەمڕۆ ، بە چاکی لە و دەرفەتانە کەلکیان وەر گرتووە·

لە۷۰ ساڵیڕابردوودا شاکارەکانی ئەدەبیاتی کوردیهەر لە عێراقدا دەرچوون·

**■ بۆ پەرەپێدانی نووسینتزیاترلە چ بوارێکەوە هەنگاو هەڵدەگری؟**

ـ تا ئێستا زۆرتر ڕۆژنامە کەرێکیسادەم·هەر بۆیەش پتر بەکارو باریۆنووسینی ڕۆژانەوە خەریکم · ناو بە ناو خەریکیلێکۆڵینەوەیئەدەبیدەبم، بەلام

رۆژنامەکەر ی مۆڵەتم نادا ٠

**■ بە رای تۆ ژیانی پە نابەری و دوورە ولاتی چ شوێن پەنجەیەك لە سە ر نووسەر و نووسینەكە ی دادەنێ ٠**

- پەنابەری، یانی ئاوارەیی ناچاری ٠هەن بە پێی ئارەزووی خۆیان کۆچ دەکەن. بۆ ژیان یا خوێندن ٠ بەلام پەنابەری کورد لە ناچاری یە، ئاوارە بوونی دڵخواز شتێکی ترە٠

پەنابەری یەتی ئاکامێکی تفت و تاڵی لە سە ر نووسەر هەیە٠ ئایا نووسەر لە نامۆیی دا دریژە سە داهێنان دەدا یانا ، ئەوە دەمێنێتەوە سەر نووسەرە کە و بارودۆخی ئاوار بوون و جێگە و رێکەی ٠

بە رای من ، نووسەر تا لە زێد و ماوای خۆی بێ ، تا لە ناو ولاتی خۆی بێ باشتر دەخولقێنێ ٠ هونە ر بە تایبەتی نووسینی ئەدەبی ، درەختێکە ئاو هەوا ی مێژوویی و کۆمەلایەتی خۆی هەیە، ئەویش نیشتمانی زمانەکەیە ٠ بەڵێ هەر زمانێك نیشتمانی خۆی هەیە ٠ زمانی ئەدەبی هەر وشەنیە، بەڵکوو تەواوی شێوەی بۆ چوون ، بیر ، هەست ، ئیدیۆم* ، کۆرانی رۆژانە ی ژیان ، خۆشی خەڵکی و ٠٠تەواوی ئاو و هەوا ی کەلتووری نیشتمانی یە ، ئەویش نەك لە حاڵەتێکی مەیبوو راوەستاودا ، بەڵکوو لە حاڵەتی جووڵانەوەو کۆراندا ٠

دەبینم کە زۆربەی پەنابەران (هی کە لانی تریش) لە دوور ولاتیدا لە داهێنان دەکەون، وشك دەبنەوەیا زۆر ست و لاواز دەبن، رەنگە هەندێ شاعیر توانیبیان لە نامۆیی دا کەشە بکەن ئەوانە دەکەمەن، جگە لەوەش شێعر وەك چیرۆك و رۆمان نیە٠ حاجی قادری کۆیی ، هەژار ، هێمن و کەسانێ تر لە نامۆیی دا لە شێعر وتن رانەوەستان یا پابلۆنێرۆدای شیلی و " محەمە د مەهدی ئەلجەواهیری " ی عەرەبی لە سەفەرو کەشت و ئاوارەیی دا هەمیشە لە هۆنینەوەی شێدر دا بوون ٠

بەلام تاقی کردنەوەی رۆماننووسەکانی یەکیەتی سۆڤیەت کە لە ٣٠ ـ ٤٠ ساڵی رابردوودا ئاوارە دەبوون، یا ئاوارە دەکران زۆربەی یان وەك لە ناوەوە بۆیان دەهات و دەیاننووسی ، لە دەرەوە ئەومیان پێ نەدەکرا ، هەر چەندە ئازادی نووسین ودەربرینیان ومدەس دەهات ٠

،زۆر لە نووسەرانی خۆمان، نووسەرانی ئاوارە لەگەڵ ئەوانەی لە ناو ولات ماون، بەراورد دەکەم دەبینم ئەوانەی لەناو ولاتدا ماون لە وانەی ئاوارە بوون چاکتر دریژەیان بە داهێنان داوە ، باشتر پێش کەوتوون ، زیاتریش دەنووسن ٠ هەندێ لەپەنابەران هەر لە نووسین کەوتوون ٠

بۆیە دەڵێم ،٠٠٠ بۆ داهێنانی هونەری،نەنیا و تەنیا ئاوو هەوای زێد وماوای نووسەر بە دەرددەخوا، تەنانەت لە ناو ولاتیش جێکە تا جێکە جیاوازە٠٠٠٠ زێد و ماوای خودی نووسەر ، یا جێکەیەکی تری دڵپەسەندی ، رەنکە لەجێکە کەی تری ولاتەکەی بۆ ی چاکتر بێ مۆرکێك کە بە بەرهەمی نووسەر ە پەنا ـ بەرەکانەوە دیارە: رق و تووڕەیی دژی ستەم، رەخنە لە خۆکرتن، لە کۆمەڵ و دام و دەزکاکانی ، خەم و پەژارەی و هەندێ جار پەشێوی فکر ، سۆز و هەست و ئەوین بۆ نیشتمان و ٠٠٠٠

**■ بزووتنەوەی وەرکێران بۆ سەر کوردی لە چ هەنگاوێکدایە، ئایا بەرای تۆ دەبێ چ هەنکاوێکی پێویست هەڵبکیرێ بۆ کەشە کردنی ئەم بزووتنەوەیە؟**

- بزووتنەوەی وەرکێران٠٠٠٠ نەخێر بزووتنەوەی ، رێك و پێکی وامان نیە٠ وەرکێران هەیە، بەلا م پچڕ پچڕ و٠٠ زۆر ست و لاوازە ، جارێ بۆ هیچ لقێکی زانستی یا ئەدەبی وهونەری وەرکێری پسپۆڕمان نیە ، هەن چەند شانۆیی، چەند رۆما نێ، چەند کتێبی مێژوویی، باش باشیان وەرکێراوە بەس،بە کشتی لە سێبواردا هەندێ بابەتی وەرکێراو هەیە ئەدەبیات و چیرۆك و رۆمان و شانۆ و لێکۆڵینەوە٠٠٠ مێژوو ، سیاسی و هەندێ بابەتی تیۆری و سیاسی ئەوانەش دیان پچڕ پچڕ دەرچوون ٠

بە پێی بیبلۆکرافیایەك لە ساڵی ١٦٠٠ ـ ١٩٨٥ . ی ز نزیکەی ٨٠٠٠ کتێب بە زمانی جۆرا و جۆ ر " کوردی و بێگانە " دەرچوون کە دەربارەی کورد و کوردستان هی وای هەیە هەموو کتێبەکە، هەندێکیش بەشێك لەو کتێبانە ، زۆربەی ئەو نووسراوانە بە غەیری کوردی نووسراون بەلام ئایا چەندیان بۆ کور دی وەرکێردراون ؟ رۆشنبیری کوردی هێشتا ئەرکی کرانی لە پێشە ، یەکێك لەوانە وەرکێرانە.بزووتنەوە ی

وەرگێرانمان نیە پێویستمان بە بزووتنەوەیەکی وا هەیە ٠ چی‌وەربگێرین ؟ دەتوانم بڵێم هەموو شتێك ماوە ، کە وەربگێردرێت ، لەو کتێبانەوە بگرە کە لە سەر کوردن‌تا بە رهەمی‌فەیلەسووفان و زانایانی جیهان و شاکارە ئەدەبی‌یەکان و کتێبی‌زانستی و هونەری٠

ئەوە ئەرکی تاکە کە سێك و تاکە رێکخراوێك نیە، بۆ ئەو ئەرکە، بۆ بڵاو کردنەوەی کوردی‌یە گشتی پێویستیمان بە ناوەندی‌یە هێزی‌چاپ و بڵاو کردنەوەی کوردی هەیە ، سەر مایەی چاك و هاندانی نووسەران و-وەرگێران لەسەر بناغەی بەرنامەیەکی زانستی،لەوەوە دەست پێ بکا ، کامانەن ئەو بوارانەی‌کە پێش هەموو شت وەربگێردرێن ؟ پاشان بە وەرگێری پسپۆر بسپێردرێن ٠ تا ئەو کاتە چار نیە مەگەر ئەوە بڵێین : ئێستەش لەو هەل و مەرجەی بۆتان دەلوێ، چی دەتوانن بگۆڕن ، هەوڵ بدەن‌بەلان‌مەرجەکانی وەرگێرانی دروست پێ شێل مەکەن ٠ بۆ نموونە ئامۆژگاری یەبە نرخەکانی‌مامۆستا "محەمەدی قازی" کە هەندێکی لە سروە کاتی خۆی لە چاپ دران سەرەتای وەرگێرانی دروستن ٠ لە تاقی کردنەوەی پسپۆرانی هێژا وەك " محەمەدی‌قازی" و تاقی کردنەوەی خەڵکی تر کەلك وەربگرن ٠

**■ بە بیروڕای تۆ رەخنە تا چ رادەیەك دەتوانێ لە سەر نووسین کاریگەربێ و دەربڕینی رەخنە دەبێ بە چ شێوەیەك بێ ؟**

- مەبەستتان دەبێ رەخنەی ئەدەبی بێ ، گەر نا ، رەخنەی گشتی بەشێکی ژیانی رۆژانەی مرۆڤە کە یا رەخنە دەگرێ‌یا رەخنەی‌لێدەگیرێ‌ کەس نیە رۆژانە بۆ چەندین جار لە وحاڵەتەدا نەبێ ٠ نە بەس رەخنەی‌نووسراو، رەخنەی‌زارەکیش کار دەکاتە سەر رەخنە لێگراو، هەر چەندە کە لەوەیە ئەم بە رواڵەت خۆی لە رەخنە گر تووڕە بکا و رەخنە کە رەت بکاتەوە ٠ لە ژیانی ئەدەبیدا ، رەخنە رۆڵێکی‌ئێجگار گرنگی هەیە ئەدەبیات بژار دەکا ، نووسەران پێ‌دەگەیەنێ ٠ هەر بۆیەش رەخنە بووە بە بەشێکی گرنگی‌فێر بوون و دەرس وتنەوەی ئەدەبی لە وڵاتاندا ٠ رەخنەش وەك ئەدەبیە چەندین‌قوتابخانە دابەش بووە٠ بە لایەنەوە باشترین و سوود بەخشترین رەخنەی ئەدەبی‌ئەوەیە دەقی ئەدەبی دەکاتە بناغەی‌لێکۆڵینەوە نەك کە سایەتی و هەڵوێستی‌کۆمەلایەتی‌نووسەرەکە٠ ئەرکی رەخنە نزیك کردنەوەی دەقەکەیە لە تێگەیشتن و یاریدە دانی خوێنەرە بۆ چێژ وەرگرتن لە دەقی جوان و سەرکەوتوو٠ لە ئەدەبی کوردیدا هێشتا رەخنە گری پسپۆرکە کارەکەی بەوە تەرخان دابێ پەیدا نەبوون ٠ زیاتر خودی‌نووسەرانن کە رەخنە لە یەکتر دەگرن٠ کەسانێکیش هەن بایەخی ئەوتۆیان بە رەخنە داوە ،وەك: د ٠ عیزەدین موستەفا رەسووڵ دەربارەی ناوەرۆکی کۆمەلایەتی ئەدەبی کوردی، بەتایبەتی چیرۆك ، حوسێن عارف ،دەربارەی شێوە و تێکنیکی چیرۆکی کوردی و چیرۆك بە گشتی ،د٠مارف خەزنەدار ، محەمەدی مەلاکەریم و نووسەرانی تر ٠٠٠

**■ پەیامت بۆ ئەو لاوانەی کەتازە دەست دەدەنە قەڵەم و سەرەتای‌کاری‌نووسینیانە چیە ؟**

- لەو رادەیە دانیم ئامۆژگاری‌بکەم٠٠٠ بۆ خۆم هێشتا پێویستم بە فێر بوونە رەنگە‌خراپیش نەبێ ، لە چاوی تاقی‌کردنەوەی کورتی خۆمەوە هەندێ تێبینی ریز بکەم و بە نووسەری خۆشەویستی لاو بڵێم :

- بنووسە و بیکوژێنەوە٠ ئەمە وانەیەکە لە نووسەرێکی تر فێر بووم تا دەتوانی بنووسە، بەلام کەم بڵاو بکەرەوە٠ لەگەڵ خۆتا بێ بەزەیی و دڵرەق بە ٠ چاوت لەوە نەبێ هەر شتێك نووسی‌ئیتر دەبێ بڵاو ببێتەوە٠ دەبێ وا خۆت رابێنی‌و ٠٠٠ لە سەدان لاپەرەی نووسراوت تەنیا ١٠-١٥ لاپەرەیان بڵاو بێتەوە ٠ ئەگەر کەوتیتە داوی‌خۆشەویستی‌هەموو نووسینێکی خۆت ئەوە دەکەویتە تەڵەی خۆپەرستی - یەکی واوە کەقەت رێگەی پێشکەوتنت نەدا. غوروور و لە خۆبایی بوون پڕ مەترسی ترین کۆسپی پێشکەوتنی نووسەرن ٠

- بەوردی‌گوێ‌هەڵخە و بە دڵەوە ئامۆژگاری و رەخنە و تێبینی‌شارەزایانی‌ئەدەب وەربگرە، چ راستە و خۆ و لامت دەدەنەوە یالە رێگەی گۆڤار وکتێبێك یا روو بەروو، بە نووسین یا زارەکی ٠ لەوە ختێکدا ئەگەر

بڕواش بە ڕەخنە نەکەی دەبێ بزانیتئەوان شارەزاتر ن
تۆ لە کاتێکدا نابێ لە ڕەخنەیەك ، یا بڵاو نەکردنەوەی
بەرهەمێك دڵسارد بیتەوە ، دەبێ بە وردیبڕوانیتە
کەم و کووری یەکانت ٠

- درێژ خایەن بە٠ هیچ کۆسپ و ڕەخنە یەك "ڕاست
یا ناڕاست) ساردت نەکاتەوە٠ بەردەوامی و مەشقی
ڕۆژانەیسەخت مەرجێکیبنەڕەتی یە٠

- سەفەر ٠ گەشت و سەفەر و دیتنیسروشت و
کۆمەڵی جۆر بەجۆر مێشك دەکەنەوە٠ یەکەم سەفەر بە
ناو وڵاتی خۆتا ، بەشار و دێهاتا ، ئەمجا بە وڵاتانی
ترابکە، بخوێنە، بیر بکە رەوە، شی بکەرەوە،خەڵکی
بدو ێنە٠٠٠

- قەت ئێرەیی بە نووسەرێکی تر نەبەی،دەردێکی
سامناك و پڕ مەترسییە٠ با سەدان نووسەریبەرزهەبن ،
بەشی تۆ،جێکەی تۆ هەر دەمێنی بە تایبەتیتۆ لە
کوردستان ٠٠٠بە یارێکی چۆل و هۆلە٠٠٠ هیچی لە سەر
نەنووسراوە ٠ بڕوانە دەورو بەرت ، لە ژیانی خێزانەوە
تا کووچە و ڕێکاوبان و ئاسەوار ، مێژوووئەمڕۆ و٠
هەموو ژیانی کوردەواری و نیشتمانیکوردەواریلە
هەزاران ساڵەوە تا سەدان ساڵی تر ،٠٠٠

هەزاران نووسەر کەڵێیداهەن ناتوانن دەربڕی
هەموو راز و گەنجینە نووستووەکانیبن چەند شێعر و
چیرۆك و ڕۆژنامە و ڕۆمان و شانۆ و لێکۆڵینەوەی
کوردیدەرچوون لە مابەتایەری عوریانەوەتا ئەمڕۆ
هەمووی بخەرە سەر یەك٠ ئەمجا هەقی بە قوژبنێکی
بچووکی ژیانو مێژووی کوردەواری نەداوە٠

نیشتمانیکە لە پوورەکەت قارەیەکیبەیارە ،
نە کێلڕاوە، پڕ ڕاز و نهێنییە، هەر کە لە پوورەکەت
بۆ خۆی دەریایەکە٠ هەر چەند بنووسی کەمە٠ هەر
بۆیەش دەبێ بە دیدێکیئێجکار فراوان بڕوانیتە
نووسین ئەمەجکە لەوەش کەکەردوون بە کشتی
نهێنی یەکیسەرمۆرە، هێشتا زانستی ئێمە وەك
" ئیسحاق نیوتۆن" دەڵێ : وەك مندالێکە لە کەناری
ئوقیانووسێکیراز٠

- ڕچکەیەك بگرە٠ ئەگەر پێت بکرێ خەریکی یەك
شت ببە٠ چیرۆك بە تەنیا ، یا ڕۆمان، شانۆ یا ڕەخنە
٠٠٠هتد! یەرت وبڵاو کردنەوەیتوانا و وەخت بە سەر
چەند ڕچکەدا ، و زەوکرێداهێنان دەفەوتێنێ ٠ئێمە
لە تاقیکردنەوەیڕۆژانەی خۆمانەوە دەڵێین٠ ڕەنگە
زەحمەت بێ مرۆڤ بەرامبەر بە تەماحی نووسینی
ئەمە یان ئەویتر خۆی ڕابگرێ٠ هەر بۆیەشکەم
نووسەر هەیە، جگە لە ڕچکەیەکیئەساسی، بایەخیبە
لقەکانی تری ئەدەب نەدابێ ٠بەڵام هەر چەندە پێ لە
سەر تاکە ڕچکەیەك دابگرێ باشتر بە ئەنجام دەگەی ٠

- زمانیکوردی ئێمەی کورد هێشتا خاوەن زمانێکی
خاوی خورسکین٠ زۆر کەم بە کار هاتووە٠ هەوڵ بدەن
بەکاریبهێنن ٠ ڕووبکەنە دێهات و وشەی ساکار و
جوانی جووتیاران بنووسنەوە٠ فۆلکلۆری گەلەکە -
تان لە فەوتان ڕزگار بکەن٠

- یەکێك ئەگەر شاعیر بوو، بەمانای هونەری
شاعیر ، ئەوە هیچ هێز ێك نیە لە شێعر گوتن ڕای
بگرێ ٠ شاعیری بەرز هەر دەردەکەوێ. بەڵام ئەگەر
بەمن بێ ، نووسەرانی لاو پتر بایەخ بە پەخشان بدەن ،
بەلێکۆڵینەوە و ریپورتاژ، چیرۆك ، ڕۆمان ، ڕەخنە ،
٠٠٠٠هتد!

- فریوینا ویزل مەخۆن٠ ڕاگەیاندنیجیهانی
زۆر ناوان دێنێتە پێش، تەنانەت ئەوانەش کە
خەڵاتیگەورە وەردەگرن، مەرج نیە ئەوان چاکترین
نووسەریهاو چەرخ بن٠ زۆر جار هەبووە بۆ مەبەستێکی
غەیری ئەدەبی نووسەرێك بەرز کراوەتەوە، لە
کاتێکدا نووسەرانیلە ئەو بەرزتر هەن ٠

- وەختێك مرۆڤ لەگەڵ خۆیڕاستگۆ بێ، تەنیا
دەست لەو بابەتە ئەدەبی یە دەدا کە زۆر شارەزایە
تێیدا و باشی دادە هێنێ. قەت فریویخۆپێشاندان نە -
خۆی ٠٠ یا بۆ ئەوەیبڵێن زۆر دەزانی دەست لە
هەموو نووسینێك بدەیتەنیا ئەوەبنووسە کە بە دڵەوە
حەزی لێ دەکەی و شارەزایی دروست و زانیاری چاکت
هەیە٠

- ئەم چەند تێبینی یە بەس نیە بەڵکوو سەردێری
کارێکی سەخت و دژوار و درێژ خایەنە لە ژیان و
هونەرینووسەرانیکورد و جیهان ورد ببنەوە و زیاتر
فێر بن ٠

# DUCHOUX...

## «دووشۆ»

### نووسراوی گی دۆمۆپاسان

### وەرگێڕلە ئینگلیسی یەوە: محەمەد ڕەمەزانی

پـەپلیکانەکەوڕەکەی کلووبەکە* دەنکوت نێوکولخانەیەکــی کەرمە، جابۆیەباڕۆن مۆردیــــان کاتێك لێی دەهاتە خـــوار ێ بالـتەکەی کەبەرەکەی خـەزبـوو ، کردەوە٠ بەلام هەرئەوەندە لەدەرکە- کە چووە دەرێ، سەرمایەکی تونـد هەتا سەرئێسکان کاری لێکـرد و ئەمە ناهومێدی لەناخیاپترکرد٠لـە پەستا لەودیوانەی قوماریان لێدەکرد پوولێ دۆڕاندبوو٠ جگـە لـەمـە، بەنێنکیش بووئەوەی دەیخواردلـە سەر دلێ خردەبۆوە ٠ ئەوەی ئیشتیای بی بردایە بۆی نەدەخورا٠

خەریك بووبەرەومالێ بێتـەوە کـە بیری دیوەزەلام ورووت وقووتەکەی ، نۆکەرەکـەی کەلەپێشخـانـــە خەوتبوو ، گیزەگیزی ئاوی سەروجاغ کازی وەتاغی بەردەستان وتـەختـە خەوە زەلامەکەی کە بەقەدرایـــی جێکاوبانی مەرگ کۆن وپەژارەهێـن بوو . لەنەکاو تەزوویەکی ساردیـان بەگیانی داهێنا کەلـە سـەرمـای مێشك تەزێنی دەرەوە ساردتربوو٠

چەند سالێك بوو هەستیتەنیایی تەپی دەدا سەردلێ٠ ئەم هەستـــە جاروبار رووودەکاتە پیرەکـــورە رەبەنەکان. جاران بەکوڕوهەلس وراو دلخۆش بوو.بەرۆژ وەرزشی دەکـرد و بە شەو رای دەبوارد٠ ئێستەهــە ر دەهات و وەڕەزتردەبوو، ئیتردلـی



بەهیچ شتێ نەدەکرایەوە٠ وەرزش - ماندووی دەکرد٠ شێو وتـەمـانـە ت نەهاریش نارەحەتی دەکرد٠ئەوەندی کەجاران کەیفی لەژنان بووئێستـە لێ یان وەڕەزبوو٠

هەموو شەوێکی وەك یەك وابـوو٠ ئاخر چی دەدی ؟هەرئەوهاوا لانـە ی هەمیشەیی کە لەشوێنێکا ،وانەلـە کلووبەکەدا کۆدەبوونەوە، هەرئـە و بنیادەمانە کە پۆل پۆل پێکـــەوە قوماریان دەکرد وبادەیانبـــردەوە یادەیاندۆڕاند ، هەر ئەوبنیادەما - نەی کە چەند قـەی خۆشیـــــان کردبووە بنێشتە خۆشە٠ هـەرئـە و کالتەوکەپە هەمیشەیی بەدەربارەی چەند شتی دیاری کراو ، هەرئـــە و بەیت وباوانە کەباسی ئابڕووچوونی چەند ژن بوو٠ ئەم شتانە بەتێکڕایی هێندەیان وەڕەزدەکرد کە جـــاری وابوو بەسەری دادەهات خـــۆی بکووژێ٠ ئیتر وازی لەسەر ئـە م ژیانە بێ ئال وکۆڕ وبێ مەبەست و ئاسایی یە نەمابوو، ئەویـــــش ژیانێکی ئاوا بێ بایەخ وسەرسەری وخەفەتبار ٠بێ ئەوەی خــــۆی هۆیەکەی بزانێ، لەوانە بوودلـــی دەرێ بۆژیانێکی پڕ لە هێمنـی و حەسانــەوە٠

ئەوەی راستی بێبیری ژن هێنانی بەمێشك دانەدەهات٠ لـە خـۆ ی رانەدەدی خۆی تووشی ژیانێکی پـڕ لە خەفەت وپەژارە بکا٠ وانەژیانی کۆیلەتی ژن ومێردایەتی، وەهـــا ژیانێکی بەجووت قۆلێ کەئەوەنـد ە خوێن تالە کە هەر کـامێکیــــان کەلیمەیەك قسە بکا ئەوی دی لـە سەری دێنەوە وهەربیروبـــڕوا و داخوازی یەك بەمێشکی یەکیـــان دابێ ئەوی دی دەست بەجێ لێـــی حالێ یە٠ باڕۆن مۆردیان پێی وابوو ژن تەنیا زەمانێك بۆســەرنجـدا ن و خۆپێوەماندووکردن دەبێ کـــە نەتناسیوە وهێشتا لەبەرچـاوت ئادەمیزادێکی نەناسراوی پڕڕەمزو رازە وپیاو لە ئاکاریدا کێـژە و حەیرانە٠ جابۆیە ئەوەی ئەم لێـی دەکەڕا ژیانێکی ژن ومێردایەتـــی بوو کەجەورو جەفای تێدانەبێ و تەنیا بەشێك لەوەختی خۆی تێــدا رابوێرێ.دیسان بیری کوڕەکـــە ی مێشکـی بەخۆوە خەریك کـرد٠

سالەکەی پێشوو دایمە بیری لـە کوڕەکەی کردبۆوە وڕۆژ بەڕۆژ لــە وانەبوو کیانی بۆ دیتن وئاشنـا بوون لەکەل کوڕەکەی دەرچــێ ٠ رووداوەکە لەسەردەمی لاوەتی ئەمدا لەدۆخێکی ئەفسووناوی وئەوینی و دلداریدا رووی دا بوو٠مندالەکە ی نارد بۆوە باشووری فەرانســـە و لەنزیك "مارسی"ی بەخێوکرابووێ ئەوەی ناوی باوکی بزانێ ٠بابـــی لە کاتی مندالی و دەرس خوێندن و

کارەکانی پاش خوێندن ، خەرجی کێشابوو تائەوکاتەی کە کورە وەسڵەتێکی باشی کردبوو وخۆی کرتبوو ٠قازی یەکی بڕواپێکرا و ببووە واسیتەیان بۆ ئەوەی نهێنی یەکە بدرکێنێ٠

جابۆیە مۆردیان هەرئەوەندەی دەزانی کە لەمارسێی منداڵێکی هەیە کوڕیایە وباشی خوێندووە و لەگەڵ کچی مێعمارو نەخشەکێشێك زەماوەندی کردووە وپیشەی خەزووری رەچاوکردووە٠ دەشیان گوت پووڵێکی باش پەیدا دەکا٠

کەوتە سەری ، ئەرێ بۆنەچێ و کورە نەدیتەکەی ببینێ وبێ ئەوەی خۆی ئاشکراکاجوان لێی وردبێتەوە وبزانێ هەیاران بۆئەوەی دەبێ رۆژی تەنگانە پەنای بۆبەرێ؟

مۆردیان هەر بەلێشاو پووڵی بۆ خەرج کردبوو وهەمووشتێکی بە دەست بڵاوی دابوویەوئەمانە بەمەمنوونی لە مۆردیان وەردەگیران٠ جابۆیە ئەم دڵینابوو کەکورەکەی بەخۆ بەزل زانینێکی کەوجانەوە لەگەڵی ناجووڵێتەوە٠٠ بیری سەفەربۆباشوور وای لەگەڵلەدابوو کەئارام وقەراری لێ هەڵگرتبوو هەرکە دەکەوتە بیر ئەوماڵەدڵخۆ ش وئاسوودەیەی قەراغ دەریا کەبووکە جحێڵ ودڵڕفێنەکەی و نەوەکانی تێدا بەدی دەکرد کە وێرای کورەکەی بەپێشوازیەوە دەهاتن ، هەستێکی زگ بەخۆ سووتان سەیر لەناخیا دەبزووت وهانی دەدا ٠

تەواوی ئەوانە دڵداری بەکورت و بەختەوەرانەکەی کاتی لاوی وەبیر دێناوە٠ داخی دەهات لەودلاوایی - یەی جارانی، ئاخەر مۆردیان یارمەتی ئەولاوەی دابوو کەتەرەقی بکا بەلام نەیهێشتبوو خاڵ وخێزانی کورە، ئەم (یانی مۆردیان بەگ) بە وەلینێعمەتی خۆ بزانن٠

بەدەم رێگاوە ،ئەم فکرانە بە مێشکی دادەهات٠ سەری کردبوو بەنێو یەخەی پالتۆخەزەکەی دا بڕیاری خۆی دابوو ٠دەستبەجێ دەست بەکاربوو ٠ ماشێنێکی گرت پێی چۆوە ماڵێ٠ بەنۆکەرە لە خەوراپەڕیوەکەی کەبۆ درکا کردنەوە لەخەوهەستابوو ، گوت:

" لوئی سبەی شەو بەرەو"مارسێ" وەرێ دەکەوین ٠ لەوانەیە دوو حەوتوو لەوێ بین٠ بارکەوبنەی سەفەر بەتەواوی تێك نێ٠"

قەتارەکە بەقەراغە خێزەلانی یەکانی چۆمی "رۆن" و بەسەردەشتە زەرد هەڵگراوەکان وبەناو دێ یە خۆرکرەکاندا تیژ تێ دەپەڕی ٠ لەم ولاتە کێوە خەفەت هێنەرەکان لەدوورەوە دیارن کەبە ئاڵقە هاتوونەوە٠

باڕۆن مۆردیان شەولە جێوبانی قەتارەکەدا نوستبوو وئێستە ش خەبەری ببۆوە و بە وەرەزی یەوە لە ئاوێنە چکۆلەکەی نێوچەمەدانە - کەیدا تەماشای خۆی دەکرد٠ لەبەر شەوقی خۆشی بەیانەی باشووردا چەند کنج ولۆچی لەدەمووچاویا بەدی کرد کە جاران نەیدەدین وئەمەش نیشانەی پیری بوو کە لە نێو ئاپارتمانە تاریکەکانی پاریسدا پێی نەزانیبوو تەماشای کۆشەی چاوەکانی و پێڵووە چرچ و لۆچاویەکانی ولاجانگ ونێو



چاوانە بێ تووکەکەی خۆی کرد و بە خۆی کوت: "هەی هاوارلەمن، خۆهەر ئەوەنیە رەنگم بە رووەوە نەمابێ، کورە بەجارێ پەکم کەوتووە!"

دەستبەجێ تاسەی ژیانێکی هێمنانەی کرد وبۆیەکەمین جار لەژیانیدا بە کوێرەیەکی نەتاسیا و تامەزرۆیی دەکرد کە ئەوەکانی لەسەرکۆشی دانێ.

دروشکەیەکی لە "مارسی"ی بە کرێ گرت ولە سەعات نزیك بە یەکی دوانیوە ڕۆ، لەبەر مالێکا وەستا کە لەبەر سپێتی، چاوی بە شەوارە دەخست و ئەمە هەر لە و مالە ئاساییانە بوو کە لە باشووری فەرانسە دروست دەکرا. مالەکە لەوسەری خیابانێك بوو کە ئەم بەرەوبەری چنارییان لێ چەقاند - بوو. کاتێ بەقەراغی خیابانەکەدا دەرۆیی، لە خۆشیا گەش ببۆوە و بە خۆی کوت: "بەخوای خۆشە!"

لەپڕمنالێکی پێنج شەش سالانە لە پشت بنچکێك را وەدەرکەوت و لەبەر دەمی دروشکەکە چەقی وچاوی زەق بڕیبووە میوانەکە. مۆردیان لێی چووە پێشەوە وکوتی: دوانیمە - ڕۆت باش، کوڕم!"
مندالە، متەقی نەکرد.

پاشان مۆردیان وەستاوهەلیهێنا کەماچی کا، بەلام لەبەربۆکەنی سیر دایناوە. لەبن لچ راکوتی:
"حەح! بێ توو نەبێ کوڕی باخەوانەکەیە." و بەرەومالەکە کەوتە ڕێ.

لەبەردەرکە تەنافێ رایەل کرابوو وکراس و دەسرە وهەولەو رووپۆش و مەلافەیان پێداهەلواسی بوو و چی وای نەمابوو ئشکە وەبن. کۆرەوی شۆراو، ڕەدیف لەبەر ڕەدیف بە بەنەوە هەلواسرابوون، بەجارێ بەر پەنجەرەکەیان گرتبوو دەتکوت جەللە[*] سۆسین لەبەر دەرکەی قەسابی گۆشت بەراز هەلواسراون.

بارۆن مۆردیان بانگی کرد پێشخزمەتێ هاتەدەر. لەسەر و وەزعی پیس وشپرێوی راوبەوەدا کە قژە سەری قول قول بەدەمووچاویا هاتبۆوە، دیاربوو راست خەلکی باشووری فەرانسەیە. دامەنەکەی پلێنگ پلێنگاوی ببوو بەلام هێشتا دیاربوو کە دەستکردێکە کە بەکەیفی لادێیی یان نەخشاوە و بنیادەمی وەبیر حەفتە بازاری لادێ ویان جلو و بەرگی دەست چەرچی دەخستەوە.

مۆردیان بەگ لێی پرسی:
"ئاغای دووشوو DUCHOUX لەمالە؟"
پێش خزمەتەکە دووپاتەی کردەوە:
"کارت بەئاغای دووشووە؟"
- بەلێ
- هالەوەتاغ، نەخشە دەکێشێتەوە.
- پێی بلێ ئاغای مێرلەن MErlin[٢] دەیەوێ چاوی پێت بکەوێ.

پێش خزمەتە بە سەر سوڕمانەوە وەلامی داوە:
"ببوورە! فەرموو وەرە ژوورێ ئەگەر کارت پێ یەتی" وپاشان هەرای کرد:
"ئاغای دووشوو، میوانت هاتووە!"

مۆردیان چووە دیوێکی زەلامەوە. تاریك بوو، چونکی کرکرەکان تانیوە دادرابوونەوە. بە جۆرێك هەستی بەوەکرد کە دیوەکە پیس وشپرێوە.

پیاوێکی قولەی تووکی سەر هەلوەریو لە پشت مێزێکی شپرێو وەستابوو، لەسەرکاغەزێکی زەلام خەتی دەکێشاوە. دەستی هەلگرت و هاتەبەرەوە.

لەجلیتقە ئاوالەکەی وشاروالە فشەکەی و قۆلە هەلمالراوەکانی رادیاربوو هەواکەی گەرمە. لە گەوشە قوڕاویەکانی شی را وەدەردەکەوت کەچەند ڕۆژ لەمەوبەر باران باریوە.

بەزاراوەی باشووری فەرانسە پرسی:
"قوربان فەرموو من ئێستە شانازی ئاشنابوون لە گەل کام مەزنما پەیاکردووە...."
- من ئاغای مێرلەنم. هاتووم بۆپەیاکردنی پەلە زەوی یەك بۆ مال دروست کردن پرست پێ بکەم.
- قوربان لە خەزمەتت دام!

پاشان رووی کردەژنەکەی کە لە دیوە تاریکەکەدا شتێکی بە دەستەوەبوو دەیچنی وکوتی:
"ژۆزێفین Josephine دایەکێ لەسەندەلی یەکان خاوێن کەوە".

مۆردیان ژنێکی لاوی دی کە نیشانەی بەسالداچوویی لێ وەدەر کەوتبوو. ژنانی بیست وپێنج سالەی شارەچکۆلەکان وایان لێ بەسەردێ، چونکی بەخۆراناگەن وپاك و خاوێنی راناگرن. لەراستی-



دا ژن بە زەبری تەواوی ئەومشوور خواردنانەی کەخۆ جوان کردن بەشێکیەتی، هەتا تەمەنی پەنجا بەرواڵەت جحێڵ و دڵڕفێن ئەمێنێ. دەماڵێك بەم لاولای شانی دا شۆڕبووە و قژی سەری زۆر پڕوپڕ بوو بەڵام بە شێوەیەکی پنکەلانە هەڵی دابۆوە، لەوە دەچوو قژی هێندەی شانەبە خۆوە نەدیبێ.

بە دەستە زبرەکانی بەرکێکی منداڵانە و چەقۆیەك وهەودایە بەن و کوڵدانێکی خاڵی و دەوری یەکی چەوری لەسەر سەندەڵی یەك لابرد و بردی بۆ میوانەکە کەلەسەری دانیشێ.

مۆردیان دانیشت ودیتی کە ئەو مێزەی وا دووشوو لەپشتی وەستاوە، جگە لەکتێب وکاغەزەکانی دووکاهووی تازەلێکراوە وکاسەیەك وبڕۆسێکی سەرودەرەبەیەك و دەمانچەیەك وچەند فنجانی پیسی لەسەرە.

جەنابی مێعمار زانی میوانەکە چاوی بەم شتانە کەوتووە، بەبزەیەکەوە کوتی:

"بم بوورە کە دیوەکە کەلی شپرێوە. خەتای منداڵەکانە." و سەندەڵی یەکی هێنا پێشێ تا لەکەڵ میوانەکەی بدوێ:

- جەنابت پەڵە زەوی یەکت لەنزیك مارسێ ی دەوێ؟

مۆردیان بەك بائەوەی بڕێك لەدووشوو دووربوو، بۆنی سیری بەلووت کەیشت. ئەم بۆنە لەخەڵکی باشووری فەرانسە هەردێ، هەرئەو جۆرەی کە کوڵ بۆنی خۆشی لێ دێ.

مۆردیان پرسی: "ئەرێ ئەوە کوری تۆبوو والەبن چنارەکەدیم؟"

- بەڵێ، کوری دووهەممە.

- کەوایە دووکوڕت هەیە.

دووشوو بەشانازیەکی ئاشکراوە وەڵامی داوە: "نە قوربان، سیان، ساڵێ کوڕێکمان بووە."

مۆردیان ئەمەی بەمێشك داهات کە بێشوو ئەم منداڵانە هەرسێك ئەو بۆنەیان لێ بێ، ئەوە لە شووشەدا بە خێویان کردوون. لە پاشکری قسەکەیدا کوتی:

"بەڵێ، پەڵەزەویەکی باشم دەوێ لەنزیك دەریا لەشوێنێکاکەبە تەنیا هەڵکەوتبێ..."

دووشوو لەسەری رۆیی. دە، بیست، پەنجا، سەد بەڵد زەوی، ئاوای هەبوو( بکرە پتریش). هەریەکەی قیمەتێکی هەبوو ولەکەڵ سەلیقەی بناعەمێك یەکی دەکرتەوە. بزەیەکی لەسەرلێوان بوو وهەژدەر هەژدەر قسەی دەکردوسەرە خڕو سێ تووکەکەی لەخۆشیان رادەوەشاند.

مۆردیان لەم کاتەدا ژنێکی بچکۆلانەی باسکی خوێن شیرین و هێندێك خەمکین هاتەوە بیری کە بەناسەوە ئەی ئوت: "ئەوەندەکدم." وەچرووك بە نەوای کەسانی دادەهات. ئەم ژنە سێ مانکان شێت و شەیدای ئەم ببوو، پاشان زکی پڕ ببوو. مێردەکەی پێشووی حاکمی موستەعمەرەیەك دەبێ. ژنەکە ترس و ناهومێدی سەری لێ شێواند بوو. خۆ دەشارێتەوە هەتا منداڵەکەی دەبێ. مۆردیان شەوێکی لەهاویندا هەڵی دەگرێ و دەبیا ودەڕوا. ئیتر لەو وەختەوەنە ژنە ئەم کوڕە دەبینێتەوە ونە مۆردیان.

ژنە، سی ساڵ دوایی لە و جێگایەی مۆردیانی لێبوو و بەنەخۆشی سیل دەمرێ. ئێستە ش ئەمە کوڕەکەیان بوو کە لە لای مۆردیانی باوکی دانیشتبوو وبە دەنگێکی کەوەك ئاسەوالە زریکەی دەهات دەی کوت: "قوربان ئەم پەڵەیە، هیچ واتەیان لێ هەڵناکەوێتەوە...."

دیسان دەنگەکەی دی وێنەی سریەی سەبایەك لەکوێی مۆردیاندا دەزرینگاوە: "ئەوینەکەم، ئێمە هەرگیز لەیەك جیانابینەوە." کاتێ دەیڕوانی بە چاوی شین وخڕی بەڵام بێ حاڵەتی ئەم پیاوە خڕپلانە بێ تامە کەچووبووە بەر

دایکی، بیری چاوە هێمن و ئەویندارەکەی یاری لەمێشکدا زیندوو دەبۆوە، بەڵام...

بەڵام هەرچی بێ ئەم پیاوە خڕپلانەیە، دەقیقەبەدەقیقەشێوەی لەگەڵ دایکیا زۆرتردەبوو. دەنگی، رەفتاری، ئیشارەی دەست ودەم و چاوی هەروەك دایکی دەچوو. شێوەی ئەم و دایکی وەك شێوەی مەیموون وبنیادەم وابوو. بەڵام ئەو پیاوە لە خوێنی ئەوژنەبوو. زۆرعادەتی وەك وی دەچوو، ئەگەرچی ئەو عادەتانە لەم پیاوەدا ئاڵ و گۆڕیان بەسەر هاتبوو و پیاو لە حەیفیان دەماسی و رقی لێیان هەڵدەستا. مۆردیان لە عەزاب دابوو ولەپڕێکدا ئەو وێك چووتە سەیرەی دایك وکوڕ کە لەپەستا پتر دەبوو، مێشکی بەخۆوە خەریك کرد ووێنەی مۆتە یان وەك پەشیمانیەکی لە دڵ کران، قەڵس وتووڕەی کرد وئازاری دا.

بەلالە پەتریسی گوتی: "ك... ك... کەنگیێ پ...پ...پێکەوە ئەوپ...پ...پەلە زەوی یە چاو لێ کەین؟"

- ئەگەر پێت خۆش بێ، سبەینێ.

- باشە. سبەینێ سەعات چەند؟

- سەعات یەك.

- زۆر باشە.

ئەومندالەی مۆردیان لەخیابان دیبووی، هات لەبەر دەرگاکەوە هەرای کرد: "بابە!"

کەس وڵامی نەداوە.

مۆردیان هەستا، ئەومندەی ئیشتیالەراکردن بوو کە چەق وچۆ کەوتبووە لەشی، وشەی "بابە"کە لەزاری ئەو مندالە هاتەدەر، وەك کوللەیەك پێکای. ئەو"بابە"یەکە بۆنی سیری لێ دەهات، ئەو"بابە" باشووریانەیە بەو گوترابوو، لەگەڵ ئەویان بوو. ئاخۆ خۆشەویستەکەی وئەورۆژانەی تێپەڕبوون بۆن وبەرامێکی چەندە خۆشیان هەبوو!

مۆردیان کاتێ دووشوو بەرێی دەکرد، پرسی:

"ئەمە ماڵی خۆتە؟"

- بەڵێ قوربان، ئارەم کریوە شانازی پێوەدەکەم. قوربان قسەی راست من رۆڵەی یەغبالم. لە کەسیشی ناشارمەوە. بەسەربەرزی دەزانم کەس ئەرکی لەسەرشانم نیە، رۆڵەی شان وباهۆی خۆمم. ئەوەی هەمە بەرەنجی شانم وەدەستم هێناوە. (قەرزداری خودانەبێ قەرزداری کەس نیم.)

مندالەکە کەهێشتا لەبەردەرکە وێستابوو، دیسان هەرای کرد: "بابە!" ئەمجارە، دەنگی لەدوورڕا دەهات.

مۆردیان لەترسادەلەرزی وخۆفی لێ نیشتبوو، دەتگوت لەمەترسیەکی گەورە رای کرد. لەدڵی خۆیا گوتی: "دەمناسێتەوە، ئەوکاتە باوەشم پێدا دەکا ودەڵێ:

بابە! وماچێکم دەکا کەبۆنی سیری لێ بێ."

- قوربان سبەینێ دەت بینمەوە.

- بەڵێ، سبەینێ سەعاتی یەك.

دڕۆشکەکە بەخرینکە خرینگ وشەقە شەق بەجادە پیەکەداکەوتە رێ.

مۆردیان کاتێ دوو دەنگ وەك شتێ لەکوێی دا دەزرینگاوە، نەڕاندی: "کاکی دڕۆشکەچی، بم گەیەنە ئیتیکا." ئەودوودەنگە کە لەکوێیدا دەزرینگاوە یەکیان دەنگی خۆش ولەسەرە خۆ و خەمگین ودوورەوە کەوتووی ئەویندارە مردووەکەی بووکە ئەی گوت: "خۆشەویستەکەی خۆم". ئەوی دی قیژەیەکی وەك دەنگی ئاسنەوالە وابوو کە دەیگوت: "بابە!" و پیاو رقی لێی هەڵدەستا. ئەودەنگە زۆرتر وەك ئەوە دەچوو یەکێ کاتی راکردنی دزێك هاوارکا: "بیگرن!"

کاتێك مۆردیان بۆشەوی دوایی چۆوە کلووب "کۆنت ئیتری پێی گوت:

- سێ رۆژە دیارنیت. نەخۆش بووی؟

- بەڵێ، حاڵم زۆر خۆش نەبوو جاروبار ژانە سەردەکەم...





# ئێمه‌وخوێنه‌ر

**بۆكان :ناسرفەتاحی**

بۆخوت هەرگوڵ بی وعومرت گوڵ نەبێ . نامە جوانەكەت گەیشت سپاسی ئەوهەمو و هەستەخاوێنەت دەكەین. دەنامەكەت دا بێجگەلەچەندپرسیار لەمەڕ ماموستاهەژار كەهیوادارین دەژمارەكانی پێشوودا وەڵامە- كانیت دۆزیبێتەوە، پرسیارتكردووە ئەم (یسم)ەچیە رەگەڵ واژەكان دەكەوێ ومانای چیە،وەك:رێئالیسم ،كوبیسم وشتیوا . كاكە گیان ئەم ( Ism )ە دەزبانە خارجیەكا- ندا بەناویا ئاوەڵناوەوە دەلكێ وناوێكی واتایی (اسم معنی )دروست دەكاو زۆرتر دەئەدەبی هونەروسیاسەت وفەلسەفە و ئابووریدا دەكاردەكرێ ومانای مەكتەب و رێبازو سەرامێكی تایبەتی دەدا وەك : ( كومونیسم communism - Commune)،(سۆسیالیسم social - socialism ) ، (رئالیسم real - realism )،( ماركیسم Markism - Mark)و(ناتورالیسم naturalism - nature) .( .

**سنه : كەیوومەرس یوسفی**

دەنامە جوانەكەت داتنووسیوتە "ئێوە و گۆڤارەكەتانمان بەقەت هەردووچاوم خۆش دەوێ" چاوت هەرخۆش بێ و سپاست دەكەین لەخوای مەزن دەپاڕێینەوە شیاوی ئەم خۆشەویستی یەبین. بەڵێ لەدەست چوونی هەژار زەرەرێكی گەورەبوو خودا تۆڵەمان بۆ بكاتەوە وهەژارانی دیكەمان بەهەژاران بۆ پەروەردەكا . كوردی نووسینەكەت زۆرجوان و رێك وپێكە و مەترسە وبنووسە . بەداخەوەئەو وێنانەی داوات كردوون لامان دەست ناكەون. چاپكردنەوەی ئاسەواری هەژار وهێمن بە دەست ئێمە نیە و بەدەست بنەماڵەكانیانە . سەركەوتوو بی.

**كامیاران : دڵشكاو كەركووكی وكەماڵ**

نامەكەتان گەیشت ، لەدڵدانەوەتان سپاس دەكەین. لێت پرسیوین بەكەم شاعیری ئەم سەردەمەكێ یە؟ پرسیارێكی نادروستە. هەرشاعیرەی تایبەتمەندی خۆی هەیە وبەدەلیلێك خۆشەویستە. یەك غەزەلی باشی هەیە،یەك شێعری نوێ باش دەڵێ ،یەك بەشێوەی كلاسیك. سەرت نەهێشتینم هەرگوڵێك بۆن وبەرامەورەنگی تایبەتی خۆی هەیە وبەورەنگ وبۆنەوەجوانە . شاعیریش وایە. كەوابوو ئەوبەراوردناكرێ بێژین : كێ گەورەترین شاعیری سەردەمە . ماموستا هەژار بەنەخۆشی قەلبی وەفاتیكرد و بۆمالبجەی خۆی دەرەوەی ولاتیش چووبوو . پێشەكی دە وت وو ێژێكدا باسی ئاسەواری ماموستامان دەسروەدا كردووە.

**ماكۆ: حوسێن ئەحمەدی**

یەكەمین ژمارەی سروە لەرێكەوتیبەهاری ۱۳۶۴ ی هەتاویدا بڵاوبۆتەوە. ژماری كورد لەشووڕەوی دەڵێن دەگاتە ۵۰۰ هەزاركەس . بەلام بەپێی ئاماری شووڕەوی ۵۰ هەزاركەس وئەوئامارە نیزیك ۷۰ ساڵ لەمەوبەر بڵا و كراوەتەوە وئێستاش ئامارە دەوڵەتی یەكانی شووڕەوی هەرئەورەقەمە بەدەستەوە دەدەن یانی دەو ۷۰ ساڵەدا لەشووڕەوی نەكوردێك مردووە ،نەكوردێك لەدایك بووە!! ئەگەر رێگام بدەن منیش بەتەمام بچم بۆئەوەی ژماریان بێتە پەنجاهەزارونەفەرێك ومنیش تاهەتاهەتا بەبژیم.

**مەهاباد : سەعدوون سۆفی بەهرامی**

ئێمەش بیستوومانە "بێلندانە"جەژنێكی كۆنی كوردەواری یە كەئێستا لەبیركراوە و كەس بەرێوەی نابا . بەلام ئەوەی كەلە خاچ پەرستانەوە بەجێ مابێ پێویستی بە لێكۆڵینەوەی مێژوویی هەیە. دیارەماموستا هەژار لەخۆوە شتێك نانووسێ وئەگەر ئەو وایدانابێ دەبێ دەلیلێكی بووبێ. هێندێك دەڵێن كاتێك وەرزێرەكان كاریان تەواوبوو و ئەوجار پێمەڕەوبێڵی خرمان هەڵاویشتن و شەنە دەبەری میح دەچەقێنن ودەڵێن بێلێن دانا یانی بێلْ مان فڕێ داو كاتی حەسانەوە و جێژن وپشوودانە. گومان لەوەدانیە كە هێندێك لەكوردەكان پێش داهاتنی دینی پیرۆزی ئیسلام ببوونە خاچ پەرست و تەنانەت مێژووناسان دەڵێن ئەوخاچەی كوردان لەسەر هەویر یانان وكولێرەبەقامك دەیكێشنەوە یادگارێكی سەردەمی خاچ پەر - ستی یە. نازانین دووهەمین كۆنگرەی فەرهەنگ وئەدەبیكورد لە كوێ وچ زەمانێك پێك دێ. بەلام ئەوەندەی دەزانین كەدەفكری داهەین. ئەو چیرۆكانەی پیرمیاو بۆیان گێڕاوی یەوە بۆمانی بنێرە ئەگەر جوان بن بڵاو دەكرێنەوە وپێویست ناكاخۆت نەقاشی- یان بۆبكێشیەوە.

**ورمێ، پادەگانی خەیبەر :سەربازی دڵێر ، محەمەد بادی**

وەك نووسیوتە لایەنگرێكی بەوەفای گۆواری سروەی . خودا لەئێمەت نەستێنێ وئەودۆستایەتی یە بەردەوام بێ. كوردی نووسینەكەت زۆرجوانە ولەمەودوابەكوردی نامەمان بۆبنووسە. وەلامی پرسیارەكانت بەم جۆرە دەدەینەوە.:

۱- پێوەندی قەومی مادوگەلی كورد بە پێی لێكۆڵینەوەی زانایانی مێژووناس وەك پرۆفسۆر مینۆرسكی ئەوەیە كە كورد لەقەومی ماد كەوتوونەوە ،یانی دەبنەباب وباپیرانی كورد.

۲- ئەوگۆوارانەی كەم وكەسریت هەیە لای ئێمە دەست دەكەون لیستی ئەوژمارانە دەگەڵ پوولەكەیان بنێرە بۆت دەنێرین . زۆرمان پێخۆشە سەرێكمان بدەی وچایەكمان لەلای بخۆیەوە.

۳ ـ لەمەڕ میرات دەتوانی (كتێبی فرایض ) كە ئێمە بڵاومان كردۆتەوە بخوێنیەوە. لە كتێب خانەكاندا دەست دەكەوێ .

**بۆکان : حوسێن پنبەچی :**

نامەکەت زۆر بە ناوەرۆک بوو ۰ خۆشحاڵین لەوەی رەسمی پیسی ژن بە ژنەت دە ژێر پێ ناوە بە مەیلی خۆت ژنت هێناوە ۰ هیوادارین دەگەڵ خێزانت پێکەوە پیرو خەرۆف بن و پاش دوو سەد ساڵ (بە هەر دووکتان) هەر ساغ و سلامەت بن ۰ نووسیوتە بۆیە کار بە دەستانی سروەت دەعوەت نەکردووە کە دەترسای پاش دوو ساڵ جواب بدەنەوە وتۆش هەر چاوەڕوان بی و زەماوەندەکەت دوو ساڵ وە پاش کەوێ ! پێویستە بزانی ئێمە هەر لە بڵاو کردنەوەی گۆوارەکەدا ئاوا تەمبەڵو تەبیلۆسین دەنا بۆ پلاو خواردن کەسمان ناگاتێ ! شۆربا وێکمان بۆ لە سەر کێوی قاف لێ بنێن بە سەعاتێک دەچین ، یاو مزناکەی فەرموو ناقیمان بکەوە !

**مەریوان : بەختیار دلێری :**

ئەگەر نووسراوەکی جوان یا شێعر و هەڵبەستێک بە زمانی کرماشانی بە دەستمان بگا بلاوی دەکەینەوە کەس چمان بۆ ناتێری و خۆشمان ناتوانین بە و زاراوە بنووسین ۰ ژمارەی کوردەکانی قووچان مان بە باشی بۆ روون نەبۆتەوە ۰ بەڵام مامۆستا کەلیمولڵاتەوەحودی کە خۆی لە کوردەکانی خۆراسانە و زۆر زانایانە لە مێژووی کورد و جۆغرافیا.و کۆمەڵناسی ئەو مەڵبەندەی کۆڵیوەتەوە ژمارەیان بە زیاتر لە میلیۆن دەزانێ ۰ ئەو کوردانە زۆر تر دەزەمانی پادشاکانی سەفەویدا وەک شا سمایل و شا عەباس گوێزراونەوە بۆ خۆراسان ۰ بۆ زانیاری زۆرتر کتێبی " حرکت تاریخی کورد بە خراسان " نووسینی کاک کەلیمولڵای تەوەحودی وەخوێنە ۰

**سەقز : سەدیق ئەحمەدی :**

هەر چەند نامەکەت بۆ بەشی چیە و سرتە باشترە ۰ بەڵام منیش لێرە رۆژانی منداڵیم کەوتە بیر ۰ تەمەنم زۆر کەم بوو ، عاشقی کچێک بووم ۰ خەریک بووم دەست لە خوێندن و هەموو کارێک هەڵگرم بەڵام خۆم راگرت و پاشماوەیەک هەموو شتێکم لە بیر چۆوە و ئێستا بەو فکرە کە ئەوەدەم - هەموو پێدەکەنم ۰ تۆش هەروای ۰ ئەو شتانە لە هەموو کەس روو دەدەن بە تایبەتی لە تەمەنی لاوەتی و سەردەمی عەزەبیدا ۰ خۆت بە کاری دیکەوە مەشغووڵ کە ۰ وە شوێن ئەو ئافرەتە مەکەوە ۰ ژن هێنان زۆر کارێکی گرینگە و دەبێ لە رووی بەرنامەوە بێ نەک ئیحساس و هەوەس و شتی وا ۰ وەک نووسیوتە دەتەوێ گۆرانی بڵێی بەڵام دەنگت ناخۆشە و داوای رێنوێنی و دەرمانت لە ئێمە کردووە ۰ عیلاجی حەمامە ۰ هەموو رۆژێ دوو سەعات بچۆ حەمام و دەوێندا گۆرانی بڵێ دەنگت دەکرێتەوە ۰ هێلکە ش زۆر بخۆ !

**بۆکان: ئەمیر رەمەزانی :**

لێت پرسیوبن لە گۆواری ئاوێنەدا نووسراوە پیتی (ع) بە پیتێکی کوردی نەناسراوە ۰ ئەگەر چاوێک بەو واژانە دابگێڕین کە پیتی "ع" یان تێدایە دەبینین کە هەموویان یا زوربەی زۆریان عەرەبین ۰ ئەو جار دە رزۆر جێگایان دا دە بینین کورد ئەو" ع" ە دەکاتە (ئ) وەک( عومەر ـ ئۆمەر )،و عەزیز ـ ئازیز ) ، ( عەبدوڕڕەحمان ـ ئاوڕەحمان ) و زۆر شتی دیکەش ۰ بەڵام تازە ئەم پیتە هاتۆتە نێو کوردی و چەسپاوە و چی دەگەڵ ناکرێ ۰ دەنا راستە دە بنەڕەتدا (ع) پیتی کوردی نیە و عەرەبی بە ۰زۆر واژەی واهەن عەرەبین و کورد پێی ڕاهاتووە وەک عیشق ، عەیش ، عەلی ، عەمر ، عەسا ، عەبا و ۰۰۰۰ کە تازە ناتوانین بڵێین:ئیشق ، ئەیش ، ئەلی ، ئەمر ، ئەسا ، ئەبا و ۰۰۰ دیارە بڕیاردان لە سەر ئەو مەسەلەیە دەبێ بدرێتە دەست کۆڕێکی کارا و لێهاتوو ۰ هیوادارین ئەو کۆڕە هەرچی زووتر پێک بێ ۰

**سەقز : محەمەد ئەمینی ئەسعەدی:**

نامە جوان و رازاوەکەت گەیشت کە پڕ بوو لە پێشنیاری جوان و بە کەڵک ۰ پێشنیارەکانت لەمەڕ پێشکەوتن و رازاوەتر بوونی سروە و خوێندنی کوردی وچلۆنا یەتی بەڕێوە بردنی کاروباری ئەم ناوەندەمان نارد بۆ ( مدیریت ) تا سەرنجی بدەن و کەلکیان لێوەرگرن ۰ پێمان خۆش دەبێ وەک بەڵێنیت داوە زۆرترمان نامە بۆ بنووسی و هاوکاریمان بکەی ۰

**شنۆ : گوندی نەڵیوان: کەریم سوهرابی :**

بەڵێ : ژنانیش لە سەریانە بچنە نوێژی جومعە و لە مزگەوتەکانی جومعە و جەماعەت دا وەک مزگەوتی سووری مەهاباد جێگای تایبەتی یان بۆ تەرخان کراوە بۆ ئەوەی تێکەڵاوی پیاوان نەبن ۰ دوکتور محەمەدی موسەددیق فارس بوو و نەمانبیستووە کورد بوو بێ ۰ حەزرەتی یونس یەکێک لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل بوو کە وەک دەڵێن لە ساڵی ۵۲۸ی پێش زایین دا پێغەمبەر بووە ۰ لە سەفەرێکی دەریاییدا تووشی تۆفانێکی گەورە بوو ۰ کەوتە دەریا و ماسی یەکی زل و زەبەلاح قووتی دا و پاش سێ رۆژان بە ساغ و سلامەتی لە قەراغ دەریا دایەوە دەرێ ۰

**نامە و سەرخۆشی ئەم ئازیزانەشمان بە بۆنەی کۆچی دوایی مامۆستا هەژار پێگەیشتووە ۰**

۱ ـ مەهاباد : سولەیمان عەبدوڵڵاپووری

۲ ـ سەقز : سمایل و ئوقی

۳ ـ پیرانشار : محەمەد خالید مرادی ئەقدەم ۰

۴ ـ سەردەشت : برایم محەمەد پووری

۵ ـ پاوە : محەمەد فەتحوڵڵاهی



# لەح...

ئەحمەد شەریفی



لە کتێبی کۆن وپیرۆزی ئاوێستایا ئاڤێستادا باسی چەند شارکراوە کە یەکێك لەوان شاری (رگا) یە کەتوێژەوانانی مێژووئاڤێستا ناسان ئەم شارەیان بە (رێی)ی ئێستاکەلەنزیك تاران دایەداوەتە قەڵەم،ئەو بۆچوونەش هەر تەنیا بە خاتری ئەوەیە کە وشەی (رگا) و (رێی) هەتارادەیەك وەیەکدەچن ،دەنا دەساوێزێکی‌تر بۆ یەکبوونی ئەم‌دوو‌ناوەشارە لە دەست دا نیە ولە ئاوێستاش دا دیارە بۆجێی هەڵکەوتنی شاری (رگا)ئاشێرمنەکراوە بەلاّم ئەز لە سەر ئەم باوەڕەم کە ئەم بۆچوونە دەبێ هەڵە بێ و رەنگە شار وولاتی (رگا)ی ئاڤێستاکۆنە شاروتازە گوندی ئێستای (لەح)ی شارویرانی مەهاباد بێ.

بۆپتەوکردن و سەلماندنی ئەم باوەڕەشم، لە پێشدا کورتە ئاوڕێك وەسەر ژیان وسەربووری زەردوشت دەدەین. بەتێکی زۆری رۆژهەلاّت ناسانی وەك دارمس تتێر، تۆلدکە- نیبرگ - هرتسفیلد برونۆهنینك - راولینسۆن و....... لە سەر ئەم باوەڕەن کە زەردوشت خەڵکی وەلاّتی مادبووە، پرۆفسۆرئیبرام جەکسۆن دەڵێ کە زەردوشت لە باشووری کۆلی ورمێ لە دایك بووە. دیارە باشووری کۆلی ورمێش دەبێتە ناوچەی پردی بەردەزەرد و مەمێند وشارویرانی مەهاباد.

ئیبرام جەکسۆن درێژە بە بیروراکەی دەدا و دەنووسێ:

زەردوشت دەبێ لە دەوروبەری گوندێکی وەك خورخورە دا ژیابێ وبووبێ. ئەم گوندەش کە پرۆفسۆرجەکسۆن باسی دەکا لە ناوچەی شارویرانە ولە باکووری مەهاباد دایە. ئەم چەشنە بۆچوونە کە زەردوشت خەڵکی ناوچەی مادبووە، لە لایەن رۆژهەلاّت ناس وئاوێستا ناسێکی زۆرەوەتەسدیق کراوە وخودالێ خۆش بوو ئایەتوڵلاّ مەردۆخ لە مێژووەکەیدا زەردوشت ،بە زەردوشتی مادی ناودەبا.

لە ناوچەی دەوروبەری کۆلی ورمێ ئێستاش هێندێ جێگا هەیە کە ئەم بیروباوەڕانە پتر کومان بردەکا ،بۆوێنە لە سەر رێگای ورمێ بۆ

مەرکەوەڕێ لە نزیك گوندی "**ئەمبی**". کۆنە قەبرێك هەیە کە دەڵێن قەبری دایکی زەردوشتە، وەلەناوچەی مەنکوڕان کۆنە گوندێك هەیە کە پێی دەڵێن (**ئاشۆگا**) .

جائەگەر بەراوەردی ئەودەستە لە ڕۆژهەلات ناسانە بەراست بدەینە قەڵەم کە زەردوشت خەڵکی مادبووە وبۆچوونەکەی پرۆفسۆر جەکسۆنیشی بدەینە پاڵ کە پێشی وایە زەردوشت لە باشووری گۆلی ورمێ واتە ناوچەی شاروێران ژیاوە، و کۆنە قەبری گوندی "**ئەمبی**" بەقەبری دایکی زەردوشت وئاشۆگای مەنکوڕان بە جێ ژیان و یادکاری زەردوشت بزانین، باس ودۆزەکە کەمێك لە دەستان خۆش تر دەبێ بۆ شی کردنەوەی بۆ چوونە کەمان لە سەر (**لەج**) یا (**رگا**) ی ئاڤێستا .

لە زمانە کۆنەکانی ئێران وکوردی دا، زۆرجار ئاڵ و گۆڕ بەسەر پیتەکاندا دێ وجێ گۆڕدەکرێن ئەگەر لەم ڕووەوە سەرنجێك وەسەر وشە ناوی (**رگا**) بدەین پێم وایە پڕبە پێستی وشە ناوی (**لەج**) بە دەست دێ .

پیتی (**ر**) ێ و (**ل**) ێ زۆرجار جێ گۆڕدەکەن و دەبنە جێ نشینی یەکتر، بۆ وێنە ئێستاش لە ناوچەی مەرکە و هەولێردا ئەم جێ گۆڕی (**ر**) و (**ل**) هەرباوە .

وەك : (**ماڵ**) دەبێتە (**مار**) واتە پیتی (**ل**) دەبێتە (**ر**) ، و(**دەلیا**) دەبێتە (**دەریا**) و زۆرشتی تر ........ و گۆڕانی پیتی (**گ**) و (**ج**) یش لەم گۆڕانە بە دوورنین وئەم ئاڵوگۆڕە لەم دوپیتەش دا هەیە. وەك (**گاوان**) بۆتە (**جافان**) یا (**جاوان**) یا مەگووس بۆتە (**مەجووس**) و زۆرشتی تر .....

جائەگەر پیتی (**ر**) ێ و (**گ**) یێ وشە ناوی (**رگا**) وەبەر ئەم یاسای گۆڕانەی زمانی کوردی بخەین، یانی پیتی (**ر**) ێ بکەین بە (**ل**) ێ و(**گ**) ێ بکەین بە (**ج**) ێ وشەی (**لەج**) بە دەست دێ.

بەلام با بزانین (**لەج**) ئێستا کوێ بە وبە کوێ دەڵێن لەج .

(**لەج**) ئێستا ناوە بۆ کۆنە گوندێك لە ناوچەی شاروێرانی مەهاباد. بەلام ئەم شاروێرانە یان شاری وێرانە دەبێ کوێ بێ ومەبەستی سەرەکی کام کۆنە شاری ناوچەی شاروێران بێ ؟ هەتا ئێستا لەم بارەوەتوێژکارییەکی زانستی نەکراوە هێندێ کەس پێ یان وایە بۆیە بەم ناوچەیە دەڵێن شاروێران چونکە کۆنە شاری دارایاس لەم هەرێمە دایە. بەلام پێم وایەئەم ناونانە هەردەبێ بە هۆی کۆنە شاری (**رگا**) یالە جەوە بووبێ، وپێم وایە کە شاری رگایا لەج لە دارایاس یادریازیش کۆنترە ورەنگە رگایا لەج لە کاتی پێش یەککرتن وفەرمان ڕەوایی مادەکاندا ئاوەدان بووبێ وتەنانەت وێشدەچێ کە لە سەردەمی (مەنا) کاندا ئەم شارەی رگا گەورەشارێکی هەرێمە بووبێ وهەتا سەردەمی زەردوشت هەرمابێ و لەم شارە دا دەستی دابێتە مزگێنی وبەشارەی ئایینەکەی خۆی.

بە داخەوە هەتائێستا کەتیبە ونووسراوەیەك لەو هەرێمە دا نەدۆزراوەتەوە ، کە ببێتە پاڵتەو پشتی باسەکەمان بۆتوێژەوانی ، بەلام لەناوچەی گەورکان لە کۆنە مەزرای گوندی (**بەیرەم**) ئەنکوستیلەیەك دۆزراوەتەوە کە نقیمەکەی وێنەیەکی زەردوشتی لە سەر هەڵگە ندراوە، و لە دەور وبەری کۆنە گوندی (**لەج**) گۆڕستانێك هەیە کە خەڵکی ناوچەکە هەتائێستا زۆرشتی عەنتیکەیان لێ دینۆتەوە. هەروەها لە دەو روبەری، (**لەج**) چەندین شوێنگەی مێژوویی هەیە کە لەبەرەوە بە کورتی دیاردەیان بۆدەکەین .

١- لە ڕۆژ اوای لەج گوندی دارەلەك هەیە کە وشە ناوەکە بە کۆن دێتە بەرچاو، رە نگە دارالەك یان شتێکی تری ئەوتۆبێ کە جاری زانیاری یەکی زانستیمان لەم بارەوە لە دەستدانییە لە مووچە ومەزرای ئەم گوندەش زۆرجارگوتەسوالەت وشتی تردۆزراوەتەوە.

٢- هەرلەم بەشەی لای ڕۆژ اوایە دا، لە نزیك گوندی سووکەند ئەشکەوتێك هەیە کە پێی دەلێن (**ئەشکەوتی بێشوەی یاخلوەی**) کە لە بەیتی (**مەحمەڵ وبرایمی دەشتیان**) دا باسی دەکرێ (**پاشان باسی ئەم بەیتە دەکەم**) وێدەچێ ڕۆژێك لە

رۆژان خەڵكی تێدا ژیابێ ، كۆنە شاری **(دارایاس)یش** هەر لەم لایەنەی لەجێ دایە·

٣- لە رۆژهەڵاتی لە جێدا ، گوندی ئیندرقاش هەیە ، وشەی "ئیندر"یا"ئیندرا"،ناوی یەكێك لە خودایانی كۆنی هیند وئێرانی بووە، و بەشی دووەمی ئەم ناوە ئەگەر بە **(كاش )** دانێین ، ناوبووە بۆ یەكێك لە خودایانی هۆزی كاسی و ئەگەر بە **(گەش )**ی بدەینە قەڵەم بە مانای **(بڵێسەی ئاگرە )**· لە نزیك ئەم گوندە دا فەقرە قا هەڵكەوتووە كە هەتائێستا كەم وزۆرشتی لەسەر نووسراوو هەر كەس بە جۆرێك لێی روانیوە و زۆرتر بە كلكۆ وئارامگای **(فراوەرتیس)** پادشای مادیان داوەتە قەڵەم، چونكە هێرۆدۆت نووسیویە كەفراوەرتیس لەباكووری گۆلی ورمێ نێژراوە ·· بەلام ئەم فەقرە قایە زۆرتر لە مەعبەدوپەرستگەیەكی مادەكان دەچێ· باشەوەش بڵێم كە خەڵكی ناوچەی شارویران بە **( فراتكا )** ی تەلەفوز دەكەن وپێیان وایە فەرهادی ناودارسازی كردووە·

ئەم وشەی **( فەقرە قایا فراتكا )** لە **( فرە تاگەیا فرتركا )** دەچێ كە بە مانای فەرمان رەوایی یە ،ئەم وشەیە لە دەورانی سلوكیا ندا ، واتە سەدەی سێهەمی پێش زایین دا باوبووە·

٤- لە بەشی لای باشووری لەجێ دا ، كۆنە پەرستگەیەك هەیە كە لە سەر شە قامەرێی مەهاباد ورمێ دایە وپێی دەڵێن بەردەكوننێ ،شێوەی دروست بوونی ئەم پەرستگەیەش وەك فەقرەقا وشوێنەوارەكانی تری سەردەمی مادەكان وایە ، لەم هەرێمانە دا ، كە باسمان كردن هەتا ئێستا كەتیبە ونووسراوە ولە وحە یەكنەبیندراوە- تەوە كە لە بەر رووناكی ئەودا ، لە بارودۆخی ناوچەكە ،لە باری مێژوویی یەوە وردببینەوە - ئەوەی كە هەتا ئێستا لە سەرشوێنەواری ناوچەكە نووسراوە زۆربەیان تەنیا بۆ چوونن و لە رووی ئاسەواری ترەوە بەراورد كراون بەلام، لەم وتارەدا باسی بەیتی مەحمەڵێ دەشتیان كرا ، لەم بەیتە دا كە لەناوچەی شارویراندازۆریش باوە، باسی فەرمان رەوایی ژنێك بە ناوی پەریخان دەكرێ كە كچی میرزۆراب شایە، لە دەقی بەیتەكە دەردەكەوێ كە پێوەندێكی تەواوی بە دەورانی بەرلە ئیسلامەوە هەیە ومامهێمن رەحمەتی لە سەرەتای توحفەی موزەفەری یە دا پێشینەی دەباتەوە دەورانی دایك شایی·

لەم بەیتەدا دەبێژێ، لە ناوچەی شارویراندا شارێك هەبووە بە ناوی دچەری یاچەلیان، رەنگە بە مرووری زەمان ئەم وشەی **(چەریاچەل )** پاش وپێش بووبێ وپاشانیش شاڵێ وكۆربەسەر بیتەكاندا هاتبێ·

پاش وپێش بە سەروشەكاندا لە كوردی دا بێ پێشینە وسەیر نیە، بۆوێنە وشەی **(خیز )** ی موكریان لە خوارووی كوردستاندا بۆتە **( زیخ )** ووشەی**(چە)** ی كوردی سەروو لە هەورامی ولەكی دادەبێتە **(جە)**·

دۆستی زاناو شاعیرم كاك عەلی حەسەنیانی لە كتێبی شاری وێراندا ،باسی بەیتێك دەكا بە ناوی **(چیری)** كە هەرلەم ناوچەی شارویراندا رووی داوە وزۆرشتی تریشی لە سەر ناوچەكە روون كردۆتەوە، هەتا رادەیەكی زۆر بۆچوونەكانمان و یەك دەچن، بەلام بالێرە دا ، ئیشارە بۆ ئەوەش بكەم كە لە ناوچەی **( سۆما )**ی سەر بە ورمێ گوندێك هەیە كە پێی دەڵێن **(چەری یاچاری)** و لە فارسی دا بۆتە **( چهریق)** كە هەر لە كۆنە وە بنەماڵەی سمكۆ لەوێ ژیاون· رەنگە ئەم وشەناوی**(چەری - چەلی ،چاری)**وشەیەكی سەكایی بێ·

سەكاكان ماوەیەكی زۆرلە گەڵ مادەكان یەك ماڵ ویەك حكوومەت بوون وتە نانەت رەنگە هەر بە كرەگەزیش بووبن، وبەدەچێ كە خێلی شكاكی ئێستا هەرپاشماوەی تۆرەمەی سەكاكان بن·

ئێستا لە ناوچەی شارویراندا هێندێك داستان وبەیت هەن كە باسی رووداوەكۆنەكانی ناوچەكە دەكەن ، وەك بەیتی چێری- بەیتی برایم ومەحمەڵێ دەشتیان وداستانی دێت كۆنە چارێ كە رەنگە ئەگەر لە باری زانستی ومێژووییەوە بروانینە ئەم چیرۆك وبەیتانە زۆرشتی شاراوەمان بۆئاشكرابێ !

دڵبەرا پایی فەراقت دڵ دەناڵێ چون روباب
بۆدووئەبرۆی میسلی تاقت بەندی جەرگم بووکەباب

بووبەبریان تۆی دەروونم، چاوپڕئەسرین دڵ زەبوونم
مەجنوون ئاسا غەرقی خوێنم لێم حەرام بووخوردوخاب

خواب وخۆراکم گرینە رەحمەتطلعالمینە
روحمێ کە بەمنی حەزینە باکۆتابێ ئەو عەزاب

باکۆتابێ داخ ودەردم ناڵەناڵ وئاهی سەرد م
بێ ئەجەل بۆت سووت وەردم بەدەیە جامی شەراب

پێم کەرەم کە جورعەیێ مەی لەومەیەی مردوودەکاحەی
تۆبەحەقی ساحێبی مەی ، بالەبەین لاچێ حەجاب

بالەبەین لاچێ حەجابە دلبەری رووئافتابە
وادەکەم ئەزخۆم حەسابە کە مترین تر ئەزکەلاب

کە مترین تر ئەزسەگانت لەوسەگانی پاسەبانت
جانی من قوربانی جانت گوڵرەوخی رووئافتاب

ئافتابی شەوقی عالەم شەه سەواری نەسڵی ئادەم
ئەنبیا یان تۆیی خاتەم ئەی شەهی عالی جەناب

ئەی شەهی لەو لاك لەو لاك تۆلەنووروئادەم ئەزخاك
جوملەیی شێخ ووەلی پاك بوون لەسایەت فەیزیاب

بوون لەسایەت ئەزبە قوربان مەحرەمی ئەسراری پینهان
قەلبی عاسیم بووبە بریان لەوسەرە رێگای خەراب

ماڵ خەراب ودڵ بەجۆشم عاشقی بێهۆش وگۆشم
خوێنی جەرگی خۆم دەنۆشم کوورەیی دڵ پڕلەتاب

کوورەئاسا دڵ بەتاوم لەت لەتە جەرگ وهەناوم
وابەعەشقی تۆ سووتاوم هاتمە حاڵی ئیزتیراب

حاڵ پەرێشان دەردەدارم خەستەیی دڵ پڕ غوبارم
ئانقەدەر بێ ئیختیارم نایەتە حەدد وحیساب

*بێ حیسابە شین ورۆیە ئەسرین وەك جۆباروجۆیە
مەقسوودم هەررەزای تۆیە ئەی شەهی رۆژی حیساب

ئەی شەه وپادشای جەلیلە "ئەحمەدی کۆر"یش زەلیلە
دامێنی گرتووی دەخیلە نەیخەیە سەختی و عەتاب

* * *

ـ ئەحمەدی کۆر ـ

* ئەم بەیتە لە دەستنووسەکەیدا وەزنی شکا بوو

# هەواری شێعر

بۆدەستەی نووسەران وکاربەڕێوەبەرانی بەرێزی ئینتشاراتی سەلاحەدین وسروەی خۆشەویست . لە دوای سڵاو ورۆژباش لەئێوەی بەرێز ، سەرکەوتنتان لەهەر هەمووشوێنێك بەتایبەت فەرهەنگ وئەدەبی بەبنەرەت ووەجاغی کوردی لەقوولایی دڵەوە ئاواتەخوازم . هیوادارم کتێبەهەڵچنراوەکانی تاوقەفەسەکان وبە گیرفانی پڕی کڕیاران هەڵچنرێ وبەچاپەمەنی تازەتر و ئاودارترجێیان پڕکەنەوە . لەدواییدا چاوەنوارم بە دودێڕ وەلامی نامەکەم بۆبنێرنەوە ، بۆوەی خاترجەم بم نامەکەم گەیوە وبەدەردی نامەکانی دیم نەچووە .
ئەمجار بەخێرا خۆتان ئەودووسێ شێعرانەم لێوەرگرن:

سڵاوی گەرم وگوڕ بۆ ئینتشارات
بەسەدبارو بەسەد . دۆخ و ئیشارات

لەپارتەورۆزێ بۆگش شارو لادێ
لە ئەونەورۆزە تانەورۆزی دادێ

بەشادی گیان ولەش تێپەربێ ساڵ و
لەحەوسین ولەخۆشی پڕبی ماڵ و

لەچاپ وپەخشیاستی وەلاتێن
منەت زۆربەی لەسەرشانی مەدانین

وەلامی شێعروجێژنی پارەکەم چوو
وەلامم ون بووداخم پارەکەم چوو

" خالەمین "

# پەری شیعر



ــ شەریف ــ

هەمووشەوێ لەئاسمان
لە عەرشی بەرزو دوورەوە

بەباوەشێ گوڵی گەش و
خەیاڵی بێ سنوورەوە

لەشوێنی هەورەکانەوە
پەری شێعر بەرێوەیە

کەهەر گوڵێکی دەستی وی
پەپوولەیێکی پێوەیە

هەواڵە خۆشەویستەکەم
فریشتەکەم دەچێتە کوێ

لەمێژە نایتە ژوانی دڵ
بەسۆزی گەرمی شێعری نوێ

مەترسە مەیژە کوندە بۆ
ملی ئەوینی سەربڕی

مڵێ کە کۆتری شێعر
لەشاری ئێمە هەڵفڕی

لەنێوشەپۆلی مانگەشەو
گەرامەشوێنی تۆ پەری

بەجێم مەهێڵە سامە چۆ
دەبەسیەمەمکە بێ بەری

کەتۆلەماڵە چۆڵەکەم
پەریوەبووی ونایەوە

شەمی هەزارویەك شێعر
لەسووچی دڵ کوژایەوە

کەلای نەمامی شێعری من
کە دانە دانە هەڵوەری

بەچەشنی هەوری کۆچەری
نەبوویە سێبەری پەری

لەترسی چاوی کوندە بۆ
مەچۆ دەخۆت مەشارەوە

بەرەوهەواری دڵ وەرە
بە دەستی پڕ هەسارەوە

بەسۆزی شێعری تازەوە
بەگوڵوشەی ئەوینەوە

بە شەونمی گرینەوە
بەشێعری ئاگرینەوە

* * *

دەڵێن دڵی پەری شێعر
بەچەشنی ئاوی کانیە

شنەی بەیان وبۆنی گوڵ
هەناسەجوانەکانیە

دەمێ لەشەوق وپێکەنین
دەمێ لەشین وزاریە

هەلاڵەکانی بەندەنی
بەهاری کوردەواریە

* * *

لەنێو شەپۆلی مانگەشەو
گەرامە شوێنی تۆپەری

بەجێم مەهێڵە سامەچۆ
دەبەسیە مەمکە بێ بەری

دەمێ دەبێتە سوورەگوڵ
بەدەستی باخەوانەوە

شەپۆلی دەنگی بولبولێ
لەکووچە باخەکانەوە

دەبێ بەشێعری ماتەمێ
لەبەردی سەرمەزارەوە

دڵۆپی گەرمی حەسرەتێ
لەچاوێ دێتە خوارەوە

دەبێ بەسۆزی نەغمەیێ
لەسینگی سازێ دێتە دەر

دەبێتە بەستەبۆ خەم و
خەیاڵەکانی رێ ی سەفەر

لەترسی چاوی کوندە بۆ
مەچۆ دەخۆت مەشارەوە

بەرەوهەواری دڵ وەرە
بەدەستی پڕ هەسارەوە

* * *



# ڕێنوێنی ئەدەبی

لە ڕێنوێنی ئەدەبی ئەم ژمارەیەدا پێشەکی نامەی یەکێك لەخوێنەرانی بەڕێز (شێرزاد — کەرکووکی) دەحەینە **بەر**چاو کەلەکوردستانی عێراقەوە لەدەست زوڵم **وزۆری ڕژیمی** بەعس هەڵهاتووەوهاتۆتە **ئێران :**

من کوردێکی ئاوارەی عێراقیم ، بۆیەکەم جار کە هاتمە کوردستانی ئێرانەوە ، لەکتێبخانەیەکی شاری بانە چاوم بەگۆڤاری "سروە" کەوت،بەپەلە کڕیم **و** خوێندمەوە ، بابەتەکانیم بەلاوە پەسەند **بوون •** بەتایبەتی بەشی "ڕێنوێنی ئەدەبی"**و "کاروانیشێعر"** **چونکە :**

**یەکەم ، والە شاعیردەکا کەزیاتر گرنگی بە** بەرهەمەکەی بدا وخۆی لەگەڵ ماندووبکا ورەوتێك بە شێعری نوێی سەردەم بدا بەبێ ئەوەی هەستی شا**عیر بریندار بکا ، کە ئەمیان لای ئێمە ئوسوولێکی تری هەیە ، ئەویش ئەوەیە کە هەر پارچە شێعریکی جوان و پڕمانا بەمەرجێ خزمەت بەئەدەبی حیزبی بەعس نەکا بێ سێ ودوو** لەژێر چەقۆی قەسابەکانی **ڕەقابەدەرناچێ وسەروگوێی** پاك دەتاشن ئینجا بڵاوی دەکەنەوە،کە جگەلە چەند وشەیەکی ریزکراوی بێ مانا هیچی تر نیە، یان وەلا دەنرێ وهەر وەلامیش نادرێتەوە،خۆ ئەگەر شێعرێکی عادیش بێ ئەوکات بە ئوسلووبێکی ئەدیبانە ڕەخنەیەکی پوخت ورێك وپێکی لێ ناگیرێ بەجۆرێك کەشاعیربۆجاری دووەم هەڵەی خۆی **ڕاست**کاتەوە و هەنگاوێك بۆپێشەوەبنێ•

دووەم :ناساندن وشارەزا بوونە لە نموونەی **شێعری لاوان** وپلەو ئەندازەی پێگەیشتنی لەکوردستان•

ئینجا پارچە شێعرێکی خۆمتان بۆدەنێرم یابڵاوی **بکەنەوە یازۆر خۆشحاڵ دەبم دێردێربیخەنەبەر ڕەخنە ولێکۆڵینەوە• دیارە ئەگەر "وشەی ڕەخنەکانیئێوە بەردیش بێ شووشەی دڵمی پێ ناشکێ" •**

**برای بەڕێز سوپاس بۆنامەو شێعرەکەت •**

**گومان لەوە دانیە** شێعروئەدەبیات دەژێرچەقۆی دیکتاتۆریەت دا بەدژواری بەرەوپێش دەچێ•ئەگەر بۆشاعیر لەپێشەوە ڕێبازوپێڕەو دابین بکرێ ، ناتوانێ شێعری بەکەلك دابڕێژێ وئەوەی دەینووسێ ڕێ ناباتە ئەوگوڵزارەی کەشکۆفەی شێعری تێدا دەپشکوێ•شێعر و ئەدەب پێش هەمووشتێك پێداویستی بەئازادی هەیە • ئەزموونی مێژوویی پێمان دەسەلمێنێ کە شاکارە ئەدەبی یەکان وجوا**ن**ترین شێعرەکان دەزەمانێکدا خوڵقێنراون کەئازادی گوتن ونووسین **هەبووە یا شاعیر** ونووسەر گوێ یان بەدیکتاتۆر نەداوە وقسەی خۆیان کردووە• بەلام بابێینە سەرمەسەلەی **ڕ**ەخنە لە **شێعرەکەت •بەر**لەنووسینی شێعر**ەکە** بەنەسرمەبەستی شێعرەکەت بۆنووسیوین ومانات بۆلێداوەتەوە کەئەو کارە پێویست نیە وئەرکی سەرشانی ڕەخنەگرە کە شێعرەکە هەڵسەنگێنێ• ئەوشێعرە ئەگەر ڕۆژێك بڵاو بکرێتەوە شەرحی تۆی دەگەڵ نابێ وخۆیشت دەگەڵی نابێ هەتالێکی دەیەوە • کەوابوو تکایە لەمەودوا شێعر لەتۆبێ وهەڵسەنگاندن لەخوێنەر وبەتایبەتی ڕەخنەگر•

ئەوجار لەنێو شێعرەکەتدا سۆزێکی شاعیرانە وەدیار دەکەوێ بەلام ئێستا زۆرپوختە نەبووە• یانی هەویری شێعر کە هەست وئیحساسە لەوجوودت دا هەیەبەلام ناتوانی وێنەوپەیکەرەیەکی پتەوی لێ دەرخەی• دیارە چونکە تەنیا دوو لاپەڕەمان ڕێنوێنی ئەدەبی هەیە بەداخەوە ناتوانین لەوەزیاترلەسەر شێعرەکەت بدوێین و نۆبەی دۆستانی دیکەیە • هیواداریین شێعرەکانی دیکەت کەلەداهاتوودابە دەستمان دەگا وردتر هەڵسەنگێنین•

* * *

**هێندێك کەس** هەرلەسەرەتاوە کەدەست بەشیعر دەکەن هەموو حەول ودەولیان وەزن وقافیەیە ولەترسی ئەم **جووتە ئەژدیهایە ، کاریان بە هیچ تایبەتمەندی - یەکی دیکەی شێعرنیە وزۆرجار تەنانەت ئەوەشیان**

## سەرگەردانی

جانتایەکی جل و بەرگ و
چەند شێعرێك و
کۆمەڵێ ئەدرێس
ئاگات لێیە ؟
ئەم وڵاتانە
مینا کەفی زاری دەریا
بەرە و لێوار
توورمان دەدەن ؟
وارەکەیشمان بۆتە خەونێك
شەوێك میوانی چاوەکانمە و
شەوێکیش هی تۆ .
دادە کوردێکیش لەم ناوە نیە
خەونەکانمان لێکداتەوە .

mocko 10 . 90

## دیمەن

ماوەیەکە لە پی دڵم
تەشتی بەردڵۆپەکانە و

دەستی خەمەش
لە ژێر بانی چەنەی ماندووما
کۆڵەکەیەکە
لە ژێربانێکی
نیوە رووخاو دا

fien 10. 90







# چەند پارچە شێعر، لە:
## بەرۆژ ئاکرەیی



## کۆبوونەوە

ئەگەر تۆ بێیت
تەنیاییم
لەبەر ئەم بایە هەڵدەخەم:
دڵم دەڵێ
ئەگەر نەیێت
یادەکانی ئەم نـــا مۆیە لوول دەدەم و
لە نێو گەرد دا ،نوقمی دەکەم:
ـ با ـ وادەڵێ
منیش سەیری وێنەت دەکەم
تۆ چی دەڵێیت ؟

katrina holm 2.91

## هەڵگەوت

هەندێ جاریش
شڵپە شڵپی ماسیە شێعرێ
گۆمی خەوم دەشڵەقێنێ و
رادەپەڕم
کاغەز گۆم و
رۆح هەویر و
پێنووس قوللاب
منیش راوچی !

10. 90 موسکۆ

# رەخنە لە سەر وتاری ئێرانی مەزلووم



سەید محەممەد سەمەدی

لە گۆواری "ئاوێنە"ی ژمارە چواردا وتارێك بە نێوی " ئێرانی مەزلووم " بە قەڵەمی دوكتۆر نەسروڵڵا پوور جەوادی بڵاو بۆتەوە • كاك سەید محەممەدی سەمەدی وڵامی ئەو وتارە و نامەیەكی بۆ ئێمە ناردبوو و داوای لێكردبووین كە لە سروەدا چاپی بكەین • ئێمەش لە ژێرەوە وەرگێردراوی ئەو وڵامە كە بە زمانی فارسی بوو، چاپ دەكەین •

" دەستەی نووسەران"

سەر نووسەری بەرێزی گۆواری " ئاوێنە "

بە رێزانی دەستەی نووسەران

وێڕای سڵاو و رێزێكی زۆر ، بە بۆنەی دەر كردنی ئەو گۆوارە پڕ بایەخە پیرۆز بایێتان لێدەكەم • لە ژێرەوە شی كردنەوەیەكتان بۆ دەنێرم كە هیوادارم لە گۆواری ئاوێنەدا بڵاوی بكەنەوە :

هەر زانستێك ئەگەر تەنیا لە بەر خۆی باسی لە سەر بكرێ و دووربێ لە دەمارگری و ئەو لایەنانەی كە باسەكە ناگرنەوە ئاكامێكی باشی دەبێ و هیچ چەشنە ناكۆكی و جیاوازی‌یەكی پێك ناهێنێ • بۆ وێنە فۆرمۆلی ئاو لە هەموو شوێنەكانی دنیادا و لە هەر بارودۆخێكدا یەك شتە ، چونكە لە روانگەی زانستی شیمی‌یەوە و بە پێی ئازمایش و دوور لە هەر چەشنە دەمارگری یەك ئەو شتە سەلمێنراوە ،بەڵام ئەگەر زانستێك - بە داخێكی زۆرەوە - تێكەڵی مەبەستی سیاسی بێ ، ئەو دەم دەبێتە هۆی ناكۆكی و جیاوازی و خولنەخواستە دوژمنایەتیشی بە دواوەیە و باس كردن لە بابەتەكەش هیچ كاتێ ئاكام و بەرهەمێكی باش و بەرێ و جێ ناگا •

ئەگەر مەسەلەی زمان تەنیا لە بەر زانستی زماننا‌سی باسی لە سەر بكرێ و رەوتی بەرە و پێش‌چوون و ئاڵ و گۆڕەكەی لە روانگەی زانستی یەوە شی بكرێتەوە

بە خاتر جەمی ئەویش وەك زانستەكانی دیكە ئاكامێكی راستو روون و ئاشكرای دەبێ و هیچ ئاڵۆزی یەكی تێدا نامێنێ • بەڵام چ بكەین كە بە داخەوە لە نێو ئێمەدا هەر كە باسی زمان هاتەگۆڕێ - ( بە تایبەت زمانی گەلانی جیاوازی ئێرانی )بە یەقین هێندێك باس و مەبەستی ( زۆرتر مەنفی و دوژمنانەی ) لە پەنا دایە و ئەوەیكە قەت بە خەیاڵیشدا نایە زمان و زماننا‌سی یە •

لەگۆواری " ئاوێنە "ی ژمارە ١٥ دا وتارێك لەژێر سەردێری " زبان فارسی و توسعهء ملی " بە قەڵەمی چەنگیز خانی پاڵەوان نووسرابوو كەنووسەر دەژێر رووپۆشی هێندێك وشە و رستەی بە رواڵەت دڵسۆز- انە دا ویستبووی فرمێسكی بەدرۆ بۆ ئێران هەڵوەرێنێ كە چی لە ژێرەوە هەر چەندی بۆی كرابوو هەوڵی دابوو كە لە دڵی بەر پرسانی پایە بەرزی دەوڵەت تیدا دڕدۆنگی و دوودڵی سەبارەت بە ئازادی زمان و نووسینی گەلانی ئێرانی پێك بێنێ و ئەوان لە گورگەشەوی خەیاڵی بترسێنێ ، بەڵام نەیدەزانی كە ئەو چەشنە قسانە لە رێبەندانی ساڵی ١٣٥٧ ی هەتاوی بە دواوە رەنگ و بۆنێكیان نەماوە • رژیمی چەپەڵی شایەتی لەماوەی پەنجا ساڵدا بە هەموو كوشتن و برین و زەختی فەرهەنگی خۆیەوە نەیتوانی ئەو مەسەلەیە خاشەبڕ كا • ئەوە دەتوانێ ئەزموون و وانەیەكی باش بێ و

ئێستا جێگای داخ و پەژارەیەکی زۆرە کە گۆوارێکی وەک ئاوێنە کە بڕیارە بەشی هەرە زۆری لە خزمەت زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی دابێ جارێکی دیکە بوختانە ـ کانی ئاغای " دوکتۆر نەسروڵڵا پوور جەوادی " لە ژمارە چواردا و لە ژێر سەردێری ریاکارانەی ( ئێرانی مەزلووم ) دا بڵاو بکاتەوە و لە کۆتایی وتارەکەشدا بنووسێ کە ئەو نووسراوە یە لە پێشدا لە گۆواری " دانش" دابڵاو کراوەتەوە بەڵام چونکە زۆر وتارێکی باشە و حەیفە هێندێک لە هاوولاتی یەکا ـ نمان کەلە گۆواری " دانش" دا چاویان پێی روون نەبۆتەوە، لێی بێ هەواڵ بن ئەوەلێرەدا بۆ چاپ هەڵیدە بژێرین ! ! هەر چەند ئەو وتارە لە سەر کتێبی ( تاریخ زبان ترکی و لهجەهای آن ) بە قەڵەمی دوکتۆر " هەیئەت " نووسراوە بەڵام تەنیا ئەو کتێبە ناگرێتەوە ٠

نووسەری وتاری ( ئێرانی مەزلووم ) خۆی دان بەوە دادێنێ کە ـ زمان ناس نیە ـ لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێش کە ئەگەر زمانناس نیە بۆ لەو بارەیەدا دەنووسێ؟ ئەگەر زمانناس نیە و تەنیا دڵی بۆ ئێران و یەکبوونی نەتەوایەتی و ٠٠٠ دەسووتێ ، لەو بابەتەشدا پێشتر وتم کە پاش رێبەندانی ساڵی ١٣٥٧ ی هەتاوی ئیتر ئەو قسەیە بڕ ناکا مەگەر بۆ ئەوانەی کە بە خەیاڵ لە ساڵەکانی بەر لە١٣٥٧دادەژین٠

ئەگەر بە زۆریش بیانەوێ گەلی کورد لە زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی فارسی و ئێرانی جیا بکەنەوە، کوردەکان ، هێشتاش ئەو کارە ناکەن ٠ کورد بە تەواوی هەستی بەو راستی یە کردووە کە ئەگەر مەبەستێکی ئاوای هەبێ راستەوە ئەو کەسەی لێ دێ کە نووری هەتاو بە جێ بێلێ و لە پەنا رووناکایی شەمێك هەڵکورمێ ٠ ئەگەر ئەو خەیاڵە لە هێندێک زەینی ناساغیشدا پێك هاتووە دڵنیام ئەو چەشنە وتار و نووسراوانە لە زەینی ئەو تاقمەیان ئاخنیوە و ئەوە بەرهەمی ئاسایی ئەو چەشنە نووسراوانە یە ٠

بە بڕوای من ئەگەر کەسێك بیەوێ لەمەر زمانی کوردی یەوەشتێك بنووسێ دەبێ لانی کەم لاپەڕەکانی ٢٨و ٢٩ ی جزمی یەکەمی فەرهەنگی فارسی دوکتۆر موعین ( بەشی پێشەکی ) بخوێنێتەوەهەتا هێندە دوور ـ لە زانستەنەکا و زمانی کوردی وەك زاراوەکا ـ نی سیمنانی و ئیسفەهانی دا نەنێ ٠ ئەڵبەتە ئەگەر نووسەرانی ئەوچەشنە وتارانە دوکتۆر محەمەد موعینیان قەبووڵ بێ !

لە روانگەی بەربڵاو و هەموو لایەنەی ئیسلامەوە ، مەسەلەی زمان و جیاوازی یەکانیان قەت بە هۆی دوو بەرەکی دانەنراوە ( و من ایاته خلق السموات و الارض و اختلاف السنتکم و الوانکم ٠٠٠٠٠) و بەرپرسانی خاوەن بیری کۆماری ئیسلامی زاناترن لەـ وەیکە ئەو چەشنە قسانە کارێکی مەنفی یان لە سەر بکا و ئەوان لەو تاپۆ خەیاڵی یانەی ئەو چەشنە وتارانە پێکیان هێناوە بترسێنێ ٠

دەستووری گشتی ( قانون اساسی ) کۆماری ئیسلامی ئێران بە تەواوی ، بەرهەمی ئەو خوێنانەیەکە لە پەڕی پاکی یەوە لە رێگای بابەتە ئیسلامی یەکانەوە رژاون.ئەو دەستوورە لە لایەن گەورەترین مرۆڤە ئیسلامی یەکانی هاوچەرخەوە رێك و پێك کراون و بە خۆشی یەوە کاتێکیش نووسراوبەتەواوی سەلمێندرا کە رێبەری مەزنی شۆڕشی ئیسلامی حەزرەتی ئیمام خومەینی ( د ٠ خ ) لە حاڵی ژیان دا بوو دیارە ئەوەش بۆ هەموو کەس روون و ئاشکرایە کە ئەگەر ئەو مەزنە چووکترین لاڕێ یی و ناراستی یەکی دیبا ، بێ لەبەر چاو گرتنی هیچ چەشنە خۆ پارێزی یەك دەق و دۆغر دەیکوت. ئەسڵی پانزدەی " دەستووری گشتی " ش یەکێك لەو ئەسڵانەیە کە ئیمام بەوردی خوێندوویەتەوە و ئەگەر زانیبای کە چووکترین دژایەتی دەگەڵ ئامانجە گرینگەکانی ئیسلامی هەیە ، بە هەر چەشنێك با پێشی پێدە گرت ئیمرۆش بە هیچ بارێکدانابێ رێگە بدرێ کە هێندێك کەس بە هۆی چەند بیانوویەکی سەردەمی شایەتی یەوە لە زەینی ژمارەیەك لە بەرپرساندا نیگەرانی پێك بێنن و بۆ خۆشیان جارێکی ترفرمێسکی بە درۆ بۆ ئێرانێ بڕێژن ٠دەبێ ئەو چەشنە نووسەرانە تێ بگەیەن ئەوەیکە دەبێتە پەڵەیەکی پاك نەکراوە بۆ یەکیەتی و یەکبوونی ئێران تەنیا وتارەکانی ئەوانە و هیچی تر ٠ گەلی کورد بە شانازی دەزانێ کە زمان و فەرهەنگ و مێژوویەکەی بەشێك لە زمان و فەرهەنگی ئێرانی ئیسلامی یە ٠



**تەنزی کۆمەڵایەتی**

# کۆنکوور





- قازی ئەحمەد -

تازە هاتبووینەوە ئیدارە و کاری رۆژانەمان دەست پێکرد بوو کە کاکە باسی هاوکارم داماو ودژ وەژوور کەوت و بێ سڵاو ئەحوالپرسی لە سەر جێکای خۆی دانیشت و هەر تك دەستی تێك ترینجاند و چاوی‌دەهەمووما ن بڕی و گوتی :

- ئەو ساڵیش نەیگرت !
ئەو ساڵیش هیچ !

سڵاویکم لێکرد و لێم پرسی :

- ج قە وماوە؟ ج ئەو ساڵیش نەیگرت ؟ مەگەر قەرار بوو شتێکمان بدەنێ ؟ یا مانگانەما ن بۆ زیاد کەن ؟

- نەبابە ئەتۆش هەر دەکە لێ ئەو شتانەتە! کوڕەکەم ئەو ساڵیش لەکۆنکوور دەر نەچوو • ئەوە چوار ساڵە پەیتا پەیتا بەشداری دەکا و سەر ناکەوێ! ئەه ! خودا بە زیادی نەکا ئەو خوێندنەش ! کۆنکوور ، کۆنکوور! هەموو ساڵێ کۆنکوور • کەس نازانێ کێ ئەم سیستمە ئەزموونەی هێنا ئەم وڵاتە !

پاش هێندێك بێدەنگی کە هاو دەردی‌ئێمەش تیکەڵاو بوو کوتی:

- راستی کێ دەزانێ واژەی کۆنکوور ماناکەی چیە ؟

کاك جافر هاوکاری سنەیی-مان هەڵیدایە و کوتی :کۆنکوور یانی کێ بەرکێ.بە فارسی و عەرەبی یانی موسابەقە••••

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کە میرزا کەریمی هاوکاری دیکەمان قسەکەی پێ بڕی و کوتی :

- مانای دروست و راستی تان دەوێ ؟

هەموو لێکرا گوتمان :

دیارە دەمانەوێ دەمانای واقیعی ئەم واژەیەمان بگەیەنێ •فەرموو: هەستا سەر پێ • وەك کەسێکی بیەوێ و تارێکی دوور و درێژ دە ربڕێ گەرووی ساف کرد و گوتی :

- کۆنکوور دە ئەسڵدا بە نەخۆشی یەکی پیس و وەکو (موسری) دەڵێن کە هەموو ساڵێك دەقرچە قرچی گەرمای‌هەوەڵ - مانگی هاویندا وەك لارەشە و تاعوون و بەلای دیکە بڵاو دەبێتەوە و هەموو لایەك دادەگرێ • بەداخەوە زۆر تریش کوڕ و کچی جحێل دەیگرن و پاش سێ چوار مانگە هێندێك چاك دەبنەوە • دیسان دە گەرمای هاوینی ساڵی داهاتوودا هەمان هەمان دووبارە سەر هەڵدەداتەوە و دیسان عالەمێکی زۆر گرفتار دە کا • ئەو دەور لێدانە هەموو ساڵێك هەیە• وەك مندارە مانگ هەموو ساڵێك بە هەزاران سەر مەڕ و ما ڵات دەفەوتێنی،کۆنکوور ە مانکیش هەموو ساڵێ سەتان هە زار کوڕ و کچی ئەم وڵاتە نەخۆش دەخا • بەڵام بەختەوەرانە ئەو نەخۆشی یە مەرگی کەمە• تەنیا ئەوە ندە یە لاوەکانما ن تووشی ترس و دڵەکوتە و غەم و پەژارە و هەراسانی و زووپیربوون و لەرزە لەرز و شەپلە و کزو و کەنەفتی و لاوازی و جیقنە سپیلکە و زکە شۆرە و زکچوونی عەسەبی و شتی وادەکا کە هەتا دەمرن لە

دەست ئەم شتانە رزگاریان نایە ٠ نەخۆشی یەك تازە ولە ولاتانی رۆژاوا سەری هەڵداوە پێی دەڵێن " ئیدز " ٠ئەوەی مەش زۆری دەکەڵ ئەو فەرق نیە ! !

کاکە باس پرسی :

- چاکە عیلاجی ئەم پەتایە چۆن دەکرێ ٠ دەرمانێك،واکسەنێك ، شتێك ، بیستوومە بۆ نەخۆشی ئیدز هیچ دەرمانێك نەدۆزراوەتەوە چونکە زۆرتازەیە ٠ بەلام زاناکا- نیان بەهەرەمە خەریکن چارەیەك بدۆزنەوە٠ باشە بۆ نەخۆشی کۆنکوور چۆن دەبێ تا ئێستا دەرمانێك نەدۆزرابێتەوە؟

- کۆنکوور نەخۆشی یەکی ئێرانی یا بلێین رۆژهەلاتی یە ٠ رۆژاوایی نیە٠ ئەگەر لە رۆژاوا با چارەسەر دەکرا ٠ بەلام ئەوەش وەك هەزاران نەخۆشی دیکە دەنێو ئێمەدا کۆن کەوتووە و تازەش عیلاج ناکرێ٠ ئەلبەتە با ئەوەش بلێیم وردە وردە هێندێك کەس خەریکن چارەسەرێکی بۆ دەدۆزنەوە ٠

کاکە باس بە پەلە قسەکەی بڕی و گوتی :

- دەسەرت گەڕێم زوو پێم بلێ : ئەو هەتیوەم دلی تۆقیوە ٠ تەواویئە و نەخۆشیانەی گوتت هەمووی هەیە٠ دەرمانەکەی چیە ٠

- لە بەر هەلاتن !

- یانی چی ؟ لەبەر هەلاتن یانی چی ؟

- ها ٠ چاك گوێ بکرە ٠ زەمانی قەدیم ئەگەر تاعوون - دەهات خەلك ناوچەیان چۆل دەکرد و مەلبەندی تاعوون لێدراویان بەجێ دەهێشت ٠ئێستا ش هێندێك لە لاوەکان فێر بوون بە



هەر چۆنێك بێ لەولاتی کۆنکوور لێدراو هەلدێن٠دەرۆن خوداکەریمە لەم ولاتە رۆژاوایی یانە دا کەسك لێدان و قاب و کەوچك شوشتن و کاری دیکە دەکەن و ئیدی کۆنکوور یان لێ نادا چونکە پێی یان خۆشە سندانیان لێدا و کۆنکووریان لێ نەدا !

کاك جافر زۆر لە مێژ بو و هەر پیشی دەخواردەوە چی نەدەگوت وەك چەوەندەری بریانی بوو ر هەلگەرابوو هەردەفیدەدا ٠ چی دیکەی خۆ پێ رانەگیرا هەستا سەرپێ و هەر دووك دەستی لە سەر میزە کە دەبن شان و سەر و کەللەیخۆیدا کردە کۆلەکەوچاوی دەرپەڕاند و گوتی :

- ئامیرزا کەریم تۆ ئەو عالەمە بە شێت ئەزانی یا خۆت نەفام ئەکەی ؟ ئەم ترەهاتە چیە ئەیدە تە خواردی ئێمەکەل ٠ ئەم حەکایەتە چەس ؟ !

پاش ئەوەیمیرزا کەریمی بێدەنگ کرد رووی دەکا کە باس کرد و لە سەرەخۆ گوتی :

- باوکم٠ ئەزانم کوڕەکەت ڕەدە و بووە ،زۆربح نارەحەتی ٠ بەلام ئەمە خەتای کۆنکوور نیە ٠ خەتای کوڕەکەی خۆتە٠ سەوادی خاس نیە٠ وەئیللا خەتای کۆنکوور چەس ؟ باشترین کامپیۆتەر و ماشین ئەلەکترونیك وان لە خزمەت کۆنکووردا ٠ هەر ماشێنەی خۆی مەغزێکە٠ مەغزی ئەلەکترۆنیك !

میرزا کەریم کە ئێستا دا نەنیشتبۆوە دەستی پێکردەوە :

- بەلێ راستە ٠ ماشێنی ئەلەکترۆنیك و کامپیۆتەر هەر یەکە خۆیان مێشکێکن و زۆر پێشکەوتوون بەلام تا ئەم مێشکە ح مێشکێك کاری پێ بکا !

- یانی چی ئاغا ئەم مزەخرەفاتە چەس تۆ ئێژی ،خوب مەعلوومە ٠ ماشێنی ئەلەکترۆنیك بە دەس هەر کەسەوە بێ شتێکی باشە و باش بەکاردێ ٠

- ئەتۆ بێ قەزابی توورە مەبە ! بزانە من چ دەلێم دوایە هەر چی دەیفەرمووی بیفەرمووو ٠ باوەرم پێ بکە مێشکی مەعیووب

مێشکی کامپیوتەریش مەعیووب نەکا! ئەو مێشکەی کامپیوتەر دەکاردەکا دەبێ ساغ بێ و عەیبی نەبێ‌دەنا کامپیوتەر تەنیا ئامرازێکە و بەس ٠ هەر دە کۆنکوور دا چاوت لێکردووە٠ نێو نووسین بە کامپیوتەرە ٠ ئەزموون‌وەرکرتن بە کامپیوتەرە ٠ جوابدانەوە بە کامپیوتەرە٠ لە سەر ئەوەش دا هەر داوتە لەبێک دەبێ دەجۆر جوزوە و نامیلکە وەرکرێ و بیخوێنێتەوە تا بزانێ چۆن ئەزموون‌بدا و چۆن رشتەیەک هەڵبژێری: بە تایبەتی رشتە هەڵبژاردن بۆتە موعەممایەک کە هیچکەس سەرە دەری لێ دەرناکا ٠ ئەوە خەتای کامپیوتەر نیە٠خەتای ئەو مێشکەیە کەباش نازانێ کامپیوتەر دەکار بێنێ!

حوسێن ئاغای هاوکارمان کە هەرکیز دەمی دەوجووڵ ە دەمەقاڵە و ئە و باسانە وەرنادا و کاری بەسەرکەسەوە نیە ئەمڕۆ لەپڕ هەڵێدایە و کوتی :

- من کارم بە باشی و خراپی سیستمی کۆنکوورەوە نیە٠بەڵام دەربارەی کامپیوتەر شتێکم بە چاوی خۆم دیوە بۆتان دەکێڕمەوە ٠ هەر وەک دەزانن من چەند ساڵێک ماڵم لەتاران بوو٠کارەکەم وابوو دەبوایە هەر رۆژە ماشێن لە جێکایەک رابکرم و ئەغڵەب تووشی جەریمەی پۆلیس دەبووم٠ تاوای لێهات ئیتر پێ رانەدەکەیشتم پوولی جەریمە بدەم و زۆرتر قەبزەکانم یا ون‌دەکرد یا دەمدڕاند و تووڕم هەڵدەدان ، هاوکارەکانم لەو کارە مەنعیان دەکردم و دەیانکوت ئەگەر رۆژێك ماشێنەکەت بفرۆشی دەبێ‌تەواوی‌پووڵەکەی بدەی لە حەقی جەریمە و درەنگ پووڵدان و خەلافی و شتی وا ، ئاخری کە را کوێزرام‌بۆ ئێرە ماشێنەکەم هێنا سەر فرۆش و لە بونکا کونیان بڕۆ خەلافی بێنە! یا غەوس هاوار!ترسم رێ نیشت٠ دەبێ چم پێ بڵێن؟ ئەو هەموو قەبزەم فڕێ داوە و دڕاندووە٠ بڵێی هەر خۆشم زیندانی نەکەن! بە ترس و لەرزەوە بەرە و ئیدارەی راهنومایی کەوتمە رێ ٠ ژمارەی ماشێنم داو داوای خەلافیم لێکردن٠ ژمارەی ماشێنەکەیان دا بە کامپیوتەر، کامپیوتەر ح کامپیوتەر ، پیاو لێی دەترسا ٠ هەزار چرای سوور و شین وزەرد بە چاولێکدانێک هەڵدەبوون و دەکووژانەوە٠ دەنگ و سەر و سەودای سەیر و سەمەرە و بروسکە و چەغماغە و فلەش و شتی سەیر و سەمەرەی دیکەی لێ دەبۆوە ٠ دە بەرامبەر یدا چەند کارزانێکی پسپۆڕ راوەستابوون و پرسیاریان دەدایە و جوابیان دەویستەوە٠ ئاخری‌منیان بانگ کرد و جوابی کامپیوتەریان دامێ کە لە سەر کاغەزێکی کون کون و کونجی کونجی نووسرابوو٠ " ماشین شمارە ٠٠٢٣٨٨٥ تهران - س خلافی ندارد ٠"

لاقم بە عەرزەوە رەق بوو !

لەخۆشیان وەختا بوو شەق بەرم !

کورە چۆن خلافی ندارد؟ دەبەرت مرم کامپیوتەر ئاوا دەبێ سەخاوەت و بەخشین !!

کێڕانەوەی ئەم نەقڵە بوو بە هۆی پێکەنین و سەروسەدای زۆرتر ٠ لە ئوتاغەکانی دیکەش را کارمەندی دیکە هاتبوونە ئەو سالۆنەی ئێمەی لێ‌بووین و هەموو دەحیلکانەوە ٠ کاك جافر تووڕەتر لە جاران هەر ئەساوری لێ دەبووە !

کاکە باس کە هێندێك دەرد ی خۆی لە بیر چووبۆوە و هاتبۆوە سەرخۆ رووی دەکاك هەمەوەند کرد و کوتی :

- راستی کاك هەمەوەند لە شۆخی بکەڕێین٠ پرسیارێك بۆ من هاتۆتە پێش، هەر چی دەکەم جوابەکەیم بۆ ساغ نابێتەوە ٠ تەعینی رشتە بۆ بەو شێوەیە ؟ دە بینی کابرا شاکرد ئەوەڵە ، زۆرباشی ئیمتیحان داوە٠رشتەی زۆر خوارەوەشی لێداوە٠ لە بارێ سیاسیشەوە پێشیان پێ نەکرتووە لە سەر ئەوەش را دەرناچێ و سەر ناکەوێ ٠ بە پێچەوانە یەکی دیکە کە زۆر لەخوارەوەیە و لە زەمانی مەدرەسەشدا زۆر شاکردی باش نەبووە سەر دەکەوێ ئەگەر حیسابی کامپیوتەرە و ئەلیکترۆنیکەو ئەم جۆرە شتانە ،بۆ دە بێ وا بێ ؟

- وەڵڵا تا ئەو جێکایەی ئەمن بیستوومە دەڵێن هێندێك لە شاکردە چاکانە بۆیە سەرناکەون کە نازانن چۆن رشتە هەڵبژێرن!

کاك جافر لە پڕ هەڵێدایە و کوتی :



ـ ئافەریم کاک هەمەوەند ! باوکم خەتای کامپیوتەر چەس ئێوە کەل کالتەی پێ ئەکەن ۰ شاگرد خۆی نازانی چی ئەکا ئێژن خەتایکامپیوتەره کەس !

کاکه باس ڕووی ده کاک جافر کرد و پرسی :

ـ باشه ، ئەم وەزارەتخانە بەرێزە بۆ چی بەم هەموو ماشێن و کامپیوتەر و زانا و پسپۆڕەوە ، خەیالێ داو تە لەبەکان تەخت ناکا و پێ یان نالێ تۆ لە فلان رشته لە فلان جێ دەرچووی و تەواو بوو! ئیتر ئەو هەموو نا و نووسین و هات و چوون و چاوەڕوانی وشتەی بۆ چیە ؟ هەر دەکەلڵە و کارنامەی دەیداتەوە بە شاگرد بەرهەمی کۆنکوورەکەشی بۆ بنووسێ باشتر نیە؟

هەمەوەند قاقایەکی کێشا و کوتی

ـ وردە وردە دەچین دە سیا سەتەوە ۰

کاکە باس بە سەر سوڕمانەوە کوتی :

ـ چۆن ؟ کوێی ئەم قسە بۆنی سیاسەتی لێوە دی ؟

ـ لە هەموو کیانی بۆنی سیاسەت دێ ۰ دەوڵەت پێتوایە ئەو هەموو هەرا هەرا یەی بە خۆڕایی ساز کردووە. ئەم شەو ە شانۆیەکی دەستکردە و بۆ سەر کەرمی ئەو عالەمە زۆر و زەوەندە بێکارە پێویستە.لە لایەکی دیکەوەباری ئابووریشی هەیە ۰یەك میلیۆن کوڕ و کچ هەموو ساڵێ لە کۆنکووردا بەشداری دەکەن ۰ کە ساڵ بە ساڵ ژمارەیان دەچێتە سەر ۰ ئەگەر هەر نەفەرێک سالانە دەو پێوەندی یەدا دووهەزار تمەن بەحەقی نێو نووسین و بەشداری و تەمری پۆست و هات و چوون و کرینی چەند دەفتەرچە و کاغەز و پووشە( فایل ) وشتی وا خەرج بکا ئەوە خۆی دەکاتە دوو هەزار میلیۆن تمەن! ئەو جار وەختی تەعیینی رشتە۰ هەزار تەلە لە سەر رێگای شاگردە بەستەزمانەکان دادە نێنەوە۰ تۆ کاتی کۆنکوور چاوێك لە دەرك و دیواری خەیابان و شەقامەکان بکە بە هەزاران ئاکاداری بلاو کراوەتەوە ۰ وەك ( تعیین رشته در بقالی مەش حەسەن با ۵۰۰۰ ریال )، ( تعیین رشته با شرکت دبیران متخصص و کامپیوتر در سلمانی حعیب مراغەای با ۶۰۰۰ ریال ) ، ( سرنوشت خود را بدست هر کسی نسپارید ، با فالگیرهاورمالهای هندی در خدمت شما هستیم ! آدرس ۰۰۰۰۰)

سەرت نەیەشێنم هەزار تەلە و داو لە سەر رێگای لاوان دەتەندرێ و تا لانیان دەکەن ۰ ئەوە خۆی دەبێتە نەوعێك سەرکەرمی و رابواردن و پوولێ پەیدا کردن و کارو کاسبی ۰ساڵ دەکەڵ ساڵ کۆنکوور لایەنی تازەی لێ دەبێتەوە۰ شانۆ کەری بە کەسی سەرانسەری یە کەهەمو و کۆمەڵگا کایە ی تێدا دەکا و هەموان سەر کەرم دەکا ۰ دەوڵەتیش قسەیخۆمان بێ نەخشی کارامەی هەیە ۰ باشترە بلێم هەلسووڕێنەری ئەم شانۆیە هەر خۆیەتی و بە س ! ئەویش دەبێ ئەم جەماوەرە بە جۆرێك بحاوێنێتەوە!

کاکە باس ۰ پیشێکی خواردەوە و هەستا سەر پێ و چاوی دە عەرزی بڕی و لەبەر خۆیەوە دەیکوت :

ـ بەڵێ ۰ کۆنکوور بەراستی نەخۆشی یەکی سامناکە ! تەنیا چارەش ئەوەیە لەبەری دەرچی و هەڵێی ! بەلام من ناهێلم کوڕەکەم ئاوارەی ولاتان بێ و لەبەر کۆنکوور هەڵێ ۰ دەینێرمە بازاری تاناکۆڕاو پوولێ پێ پەیدا دەکەم !

# حەسرەونەی

پێی گوت ڕۆژێکی بادەی تڕش وتاڵ
هاوسای خۆشەویست ئەی کاکی شەماڵ

لەچی ڕەنجاوی دایم دەناڵی
شین ورۆ ڕۆتە یان کزو تاڵی

پشت ڕۆ ڕۆیە هەرئاە وناڵە
عالەم لەدەستت کەوتۆتە زاڵە

ئاوارەی شاخی هاودەمی شوانی
دوورلە ئاوایی وبەزم ودیلانی

ئاخر تۆچیتە واشین وهاوار
کەچاکەت نیە وخراپەش بەبار

* * *

نەی جوابی داوە گەلێ بەنەرمی
برا ۰۰لەمن وتۆ دوورە هاودەمی

من لەشایی وشاربۆیە بێزارم
کە نەی زاربڕاو دوور لە هاوارم

ئەمن شەماڵم پیشەم ناڵینە
هاودەمم ئاهەو بەرهەمم شینە

دڵم زامارە، دەروونم کەیلە
دەردوزامەکەم هۆی دووری لەیلە

لەکۆچەر ماوی لە خەوبێزارم
ئاوری گەشاوەی کۆنە هەوارم

دەردوزامی من هۆی جودایمە
نەوای بێدادیم بێ نەوایمە

ئاوێنەی گەشی دیاری جوانیم
بووژێنەرەوەی رازی نیهانیم

ئەوشین ورۆیەی هەڵدەستێ بەسۆ
ناڵەی گەرمی منەو ئاهی ساردی تۆ

دڵێ لەلامان نایکا سکاڵا
کەلەو ئاهێک دێ ولەمن سەد ناڵە

* * *

ـ محەممەد ئەسەدی ـ






## موژده

لەناو چاوی ، پەشەورنگی پاییزا ،
قەتیس مابووم.
خۆم راتەکان ...
هەڵوە ریمە سەر خاکی تینووی کوردستان !
پەڵە هەور ،
رەش هەڵگەرا
توند نەراندی
هەوای شکان !
وەکوو دەریا
بۆ شەپۆلی ، بەکوڵ کریا :
- ئەی رۆ زستان
ئەی رۆ زستان !
زەوی پشکووت
زەردە خەنە
پەڕییە سەر
لێوی وشکی کانیاوەکان .

دلێر میرزا

## سێبەر

ئازیزەکەم
ئەگەر سبەی
لەتەسکایی کۆڵانێکا
لەسەر سینگی شەقامێکا
ئاوڕت داوە وبەدواتەوە
شێعرەکانی منت بینی
رانەمێنی
شێعرەکانم لەسێبەری رۆحم دەچن
بۆهەر لایەك هەنگاودەنێی
بۆ وێ دەچن

موختار ئەحمەدی

## ئاوارەیەك «بۆ ئاوارەکانی حەڵەبجە»

لە قەراغی رووبارێکا
ئاوارەیەك ، تەك و تەنیا
خۆی لە گۆشەی بێ دەنگیدا
حەشاردابوو !
ئەژنۆی گرتبووە باوەشی و
لە سووچێکا هەڵکور مابوو !
سەرنجم دا
کەلێم روانی ،
دڵۆپ ، دڵۆپ ، فرمێسکی کەش
وەکوو یاقووت
دەتکایە سەر گۆناکانی
وتم بۆ چی ؟
لەوەلاما ، تیشکی نیگای چاوی لێڵی
وەکوو نەشتەر ،
بڕیە نێوچاوەکانم و ... هیچی نەگوت !!
پاش ماوەیەك
کپ و خامۆش ، بە نامۆیی ،
هەر بە تەنیا " بێ دەنگی " بوو ،
کە جێی هێشت و ،
لێی دا رۆیی !!

ع - نەقیب






گۆران حەلەبچەیی

مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە : لە رابوردوویەکی زۆر دووردا قازی یەك هەبوو · زۆر دادپەروەر و پیاو چاك بوو · هەر دەم لایەن راستی دەگرت و پشتگەرمی لە هەژاران و بەشخوراوان دەکرد · ئیدی هەر کەس مافی پێ شێل کرابایە و بەشی خورابایە پەنای بۆ ئەو قازی یە دەبرد بۆ ئەوەی یارمەتی بدا ·

دەگێڕنەوە ، دەڵێن هەر لەو وڵاتەی کە قازی یەکەی تێدا دەژیا جووتیارێکی هەژار و دەست کورت هەبوو · ئەم جووتیارە . کیژێك و کوڕێکی هەبوو کە لە تەمەنی دوازدە و پازدە ساڵیدا بوون · کیژەکە زۆر زیرەك و ژیر و زرەنگ بوو · بەڵام کوڕەکە بە پێچەوانە . تا بڵێی سست و دەبدەنگ و نەزان پەرەست بوو · تاکە شتێك کە ئەم خێزانە پێی دەژیان و سەرچاوەی گوزەران و خێر و خۆشیان بوو تەنها کاوڕە مێ یەك بوو · شیرەکەیان دەدۆشی و ماست و کەرە و پەنیریان لێ دروست دەکرد و لە بازار دەیانفرۆشت و بە پارەکەی پێویستی ژیانیان پێ مەیسەر دەکرد و هەر وەها خۆشیان لە بەر و بومی کاوڕەکەیان دەخوارد ·

لە سەرەتای بەهاردا کاوڕە مێ یە بەرخۆڵەیەکی خنجیلانەی بوو کە بووەمایەی دڵخۆشی بۆ خێزانەکە · زۆری نەبرد جووتیاری هەژار نەخۆش کەوت · نەخۆشی یەکی وەها کە هیوای ساغ بوونەوەی نەبوو ··· بۆیە رۆژێك کوڕ و کیژەکەی بانگ کرد و پێی گوتن : رۆڵەکانم ئەوا من دەمرم و لە کاوڕە مێ و بەرخەکەی بەو لاوە شتێکی ترم نیە لە

پاشم بە جێ بمێنێ · جا ئەمەوێ ئەوەی هەمە بۆتان بەشی بکەم بۆ ئەوەی هەر کەس خاوەن بەشی تایبەتی خۆی بێ و لە پاشە رۆژدا پێی بژی ·

کیژەکەی گوتی : بابە گیان ، ئێمە خوشك و براین و هەر چیمان هەیە و نیە پێکەوە دەیخۆین و پێکەوەش دەژین ، ئیدی ماڵ بەش کردن بۆ چی ؟ !

باوك لە وەڵامدا گوتی : کیژی شیرینم قسەکانت راستن . بەڵام ژیان هەزاران پێچ و پەنا و رووداوی چاوەڕوان نەکراوی تێدایە هەر بۆیەش حەز دەکەم هەر کەس بەشی خۆی هەبێ ، نەك لە پاشە رۆژدا خوا نەخواستە ناخۆشی و ناکۆکی بکەوێتە نێوانتانەوە ·

کیژەکە گوتی : باوکی خۆشەویستم ، تۆ چۆنت پێ چاکە با وا بێ ·



بەڵێ ، پاشان باوکیان بەرخەکەی دایە کیژەکەی وکاوڕەکەشی دایە کوڕەکەی هێندەی نەخایاند باوکی هەژار کۆچی دوایی کرد ·

کیژەکە دڵی زۆر بە بەرخەکەی خۆش بوو هەموو رۆژێ دەیبردە لەوەڕ و گیای نەرم و ناسك و تەڕی دەدایە

و لە ناو قەرسیل* و مەزرای پارا و دایاری لە تەك
دەکرد • رۆژێ دوو جارانیش دەیدایە بەر دایکی بۆ
شیر خواردنەوە • هەر وەها پاك و خاوێن رای دەگرت
و هۆگری یەکتری ببوون !

رۆژ بە رۆژ بەرخەکە قەڵەوتر و جوان تر دەبوو
هەتا لە کۆتایی بەهاردا بووە مەڕێکی قەشەنگ•کاتێك
براکەی مەڕەکەی بەو جۆرە دیت کەوتە پیلان ڕێك خستن
و هەوڵدان بۆ وەدەست هێنانی • چونکە لە سەرەتاوە
تەماحی تێکردبوو بەلام چاوەڕێی دەکرد گەورە بێ و
پێی بگا • ئەوا ئێستا گەورە ببوو ، دەیهەویست لە
خوشکەکەی داگیر بکات • بۆ ئەم مەبەستەش کەوتە
بیانوو گرتن و گەڕ ئالاندن لە خوشکەکەی کە گوایە
مەڕەکە هی خۆیەتی و دەبێ بیداتەوە •

کچەکە زۆر هەوڵی دا کە براکەی واز لەو
داواکاری یە بهێنێ و لە کەڵی شەیتان بێتەخوارەوە
هەر وەها وەسیەتەکەی باوکی وەبیر دەختەوە•بەلام
هیچ سوودی نەبوو • کوڕەکە هەر لە سەر داواکەی
خۆی سوور بوو و لە ئەنجامدا مەڕەکەی بە زۆر برد بۆ
خۆی •

خوشکە زانی کە هەوڵدان لە گەڵ براکەیدا
بێ سوودە پەنای بردە بەر دادگا ، بۆ ئەم مەبەستەش
خۆی گەیاندە لای قازی دادپەروەر • کیژەکە
بەسەرهاتەکەی بۆ قازی گێڕایەوە • قازی ، فەرمانی دا
کوڕەکە ئامادە کەن • زۆری نەخایاند کوڕەکەیان هێنا
بۆ لای قازی • کوڕەکە لە بەر دەمی دادگادا نەهی لە
قسەکانی خوشکەکەی کرد و هەر پێی لەوەدا دەکرت
کە ئەو مەڕە هی خۆیەتی و مافی خوشکەکەی بە سەرەوە
نیە •

قازی ، رووی کردە خوشك و براکە و گوتی :

- ئێستا سێ پرسیارتان لێ دەکەم هەر کامتان
بە ڕاستی وەلامەکانتان دایەوە مەڕەکە هی ئەوە •

کیژە گوتی : فەرموو ، من ئامادەم بۆ هەر
پرسیارێك •

بەلام کوڕەکە وتەی لێ نەهاتە دەرەوە •

قازی گوتی : پیرۆزترین و بە نرخترین شت بۆ
مرۆڤ چی یە ؟

کوڕ : گەورەم ، پیرۆزترین و بە نرخترین شت
بۆ مرۆڤ سەروەت و سامانە •

قازی : چۆن و بۆ چی ؟



کوڕ : ئەگەر مرۆڤ سەروەت و سامان بێ مانای
ئەوەیە بەو سەروەت و سامانە دەتوانێ ببێتە خاوەنی
هەموو شتێ و بە خۆشی و کامەرانی بژی • ئارەزووی
چی بکات وە دەستی بێنێ ••• ئەگەر سەروەت و
سامان ئەوەندە پیرۆز نەبایە خەڵکی هەوڵی خڕ
کردنەوە و پەیدا کردنیان نەدەدا •••

پاشان ، قازی ، رووی کردە کیژەکە و گوتی :

- کچم ! تۆ چی دەڵێی ؟

کیژ : گەورەم من دەڵێم پیرۆزترین و بە
نرخترین شت بۆ مرۆڤ خاکە •

قازی : چۆن و بۆ چی ؟

کیژ : خاك مایەی ژیان و بەردەوامی مرۆڤە
هەر لە سەر ئەم خاکە باو باپیرانمان ژیاون و ئێستا
ئێمەش لە سەری دەژین • هەر خاکە هەموو جۆرە
گیانلەبەر و زیندەوەرێکی لە سەر دەژی و خواردن و
دانەوێڵەش بۆ هەموویان مەیسەر دەکا • هەر خاکە

کشت و کاڵ و دەغڵ و دان و جۆرەها میوەی خۆش و بە تاممان بۆ بەرهەم دێنێ هەر لە ناخی خاکەوە ئاوی زلاڵ و شیرین و ساردمان دەست دەکەوێ . ئەم هەموو جەنگەی لە جیهاندا روو دەدات . تەنها لە پێناوی خاکدایە .

قازی : زۆر باشە ، ئێستا پرسیاری دووەم چ کاتێك مرۆڤ سەنگینە ؟

کوڕ : ئەو کاتەی سەنگینە ، گەر مرۆڤ خاوەنی پارە و پووڵ بوو ئەو کاتە خۆی بە سەنگین و گران دەزانێ و خەڵکی ڕێزی لێ دەگرن و کڕنۆشی بۆ دەبەن و داوای یارمەتی لێ دەکەن و لە ناو خەڵکدا پلە و پایەی تایبەتی دەبێ !

کیژ : نەخێر ، جەنابی قازی ! ... مرۆڤ ئەو کاتە سەنگینە کە خاوەنی وڵاتی خۆیەتی و لە وڵاتی خۆیدا دەژی . مرۆڤی بێ وڵات وەك باڵندەی بێ لانە وایە هەر شەوێ لە سەر داریێك ڕۆژ ئەکاتەوە جا مرۆڤی دەوڵەمەند و پارەدار لە هەر کوێ بێ هەر دەم هەست بە کەمی و نامۆیی دەکات سامان و سەروەتەکەی ناتوانێ هەستی نامۆیی و بێ وڵاتی لە دڵ و دەروونیدا بسڕێتەوە . بە هەموو سامانەکەیشی ناتوانێت بستە وڵاتێك بکڕێ . با و باپیرانمان ڕاستیان کوتووە بەرد لە شوێنی خۆی سەنگینە !

قازی : پرسیاری سێهەم ، ئەوەیە مرۆڤ کەی زەبوون دەبێ ؟

کوڕ : ئەو کاتەی سەروەت و سامانی لە دەست دەدا و دەیدۆڕێنێ . مرۆڤی بێ سەروەت و سامان وەك درەختی ڕووتی بێ گەڵا وایە لە هەموو لایەکەوە خەڵکی بێزی لێ دەکەنەوە و ڕێزی لێ ناگرن و جێی متمانە نیە و هەموو کات خۆی بە کەم و زەبوون دەزانێ و هیچ شتی ڕزگاری ناکا ، تەنها پارە نەبێ . کیژەکە لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا گوتی :

ـ من دەڵێم مایەی زەبوونی مرۆڤ تەنها لە دەست دان و نەبوونی سەربەستی یە . گەر مرۆڤ سەربەست نەبوو ئیدی ناتوانێ هیچ کارێکی سوود بەخش بکا و ژیانی ڕۆژانەی تاڵ دەبێ . ئاو و هەوا تا چ رادەیەك بۆ مرۆڤ پێویستە . سەربەستیش بەو رادەیە پێویستە . ئەگەر سەربەستی نەبێ مرۆڤ بە ئاسانی زۆری لێ دەکرێ و مافی دەخورێ . وەك ئێستا براکەم دەیەوێ مافی من بخوات، سەربەستی تا ئەو رادەیە گرنگە کە تەنانەت باڵندەش پێویستی پێی هەیە و هەستی پێ دەکا . بۆیە کاتێك لە قەفەزدا بەند دەکرێ بەردەوام بیر لە دەرباز بوون دەکاتەوە و هەوڵدەدا بە دەندووکی دەرگاکە بکاتەوە و بگەڕێتەوە بۆ جیهانی سەربەستی.

پاش ئەم وەڵامانە ، قازی وەڵامەکانی کچەکەی پەسند کرد و زۆر دڵخۆش و شاگەشە بوو . لە ئەنجامدا فەرمانی دا مەڕەکەی بۆ بگەڕێننەوە و هەر وەها خۆشی خەڵاتێکی گەورەی کرد و لە هەمان کاتدا فەرمانی دا کوڕەکە بۆ چەند ڕۆژێ بخەنە زیندانەوە و بە هیچ جۆرێ خواردن و ئاوی نەدەنێ تەنها ڕۆژێ دراوێکی بۆ فڕێ بدەنە ژوور تا کوو بزانێ ئەگەر سەربەستی نەبوو بەو دراوە ناتوانێ بژی و سەربەستی پێ دابین بکات .

# شوان و شێرکۆ (۱)

شوان و شێرکۆ ، دوو لاون کە لە دانیشگای تاران دەخوێنن • زۆر جار ، باس و دەمەتەقەیان دەبێ • لە سەر زۆر مەبەست دەدوێن • ئەوانیش وەکوو هاوالەکانیان ، نەکرێکارن ، نە سامانداز ، تەنانەت لە سەر سفرەی کۆمەڵ دە ژین ، تا پێ بگەن • پاش تەوا و کردنی دانیشگاش ، دەس بە کار بن • بەڵام ئەوانیش دەزانن تا دەخوێنن ، میوانی گەل و کۆمەڵن • دەبێ باش بخوێنن ، بۆ کۆمەڵی نەدار و رووتاو لە مەرن•پێویستە خۆنەخافڵێنن • زووتر شان بدەنە ژێر کار • لە فێر بوونیش نەوێستن• گەلی بە کار و زانا و بەبڕوا ، تێدەکۆشن و پشوو نادەن •

ئەمنیش تازە کەیشتبوومە لایان • شەوێ نەنوستبووم • رۆژی جومعە بوو • ئەوانیش خەریکی رێك و پێك کردنی وەتاغەکەیان بوون • پاشی بە خێراتن و ئەحوالپرسی ، دەنگ و باسی وەڵاتیان لێ پرسیم • باڵنجێکیان لە سەر سەندەڵی ئاسنەکەدانا و لە لایان دانیشتم • کەوتنە سەر باسی خۆیان • لە بابەت میکرۆب و ویرووس دەدوان • لە قسەکانیان رادیار بوو کە لە وەڵاتە پێشکەوتووەکان ، پەلامار براوەتە سەر میکرۆبەکان•دەیانەوێ ئەوان بە سۆغرە* بگرن • وەبیرم هاتەوە کاتێك ئەمن دەمخوێند ، هەر باسی پەلاماری ئیستیعمار و داگیرکەرەکان بوو بۆ سەر وەڵاتە بێ تاوانەکان • خەڵکی ئەم وەڵاتانەیان ، بەسۆغرە دەگرت•

بەڵام ئێستا دنیا چەند گۆڕاوە ! وا دیارە وازیان لەو ـ چەشنە پەلاماراندهێناوە • باسەکەیان زۆر قووڵ بوو • دەیانگوت : زۆر ماکە* و دەرمان و شتی وا هەیە کە بە هۆی داچاندن و پەروەردە کردنی ، میکرۆب وەدەس دەکەوێ• بەم چەشنە گەلێك میکرۆب دۆزراونەوە،تەنانەت دەسکاریشیان کردوون • ئاڵوگۆڕی وایان تێدا پێك هێناون کە لە پێشدا وا نەبوون• ئەم میکرۆبانە وەك کارخانەی کیمیاگەری کاریان بۆ دەکەن • ماکەی زۆر بە نرخ ساز دەکەن کە لە بازاری جیهانی دا بە تایبەت بە وەڵاتە دوا خستراوەکانی زۆر بە گران دەیفرۆشن •

هەروا گوێم دابووە ئەم وت و وێژە شیرینە • شوان گوتی :

شێرکۆ قەت ئاگات لێیە لە چاندن و هەوێن کردن و پەروەراندنی ئەم زیندوو* لانە چۆن دەرمان و خواردەمەنی و ماکەی بە نرخ ساز دەکەن ؟

ـ دیسان دەستت کرد بە کوردی واژە ساز کردن و پەتی ئاخاوتن ؟ ئەم واژەیەت لە کوێ هێنا ••• زیندوولە ، ئەمەت چۆن ساز کرد ؟

ـ مەبەستم لە زیندوولە ، میکرۆبە ، بەڵام میکرۆب لە نێو ئێمەدا زۆر بەدناوە • نێوی بە پیس و خەراپ و لاسار دەرکردووە • تەنانەت بیر لەوە ناکەینەوە کە گەلێك میکرۆب هەن دەخزمەت ئێمە و گیانداری دیکە دان • هەر کوتیان میکرۆب ، ماکەی پیسی



ـ دوکتۆر ئەبریشەمی ـ

لاسار و نەگبەت ، دێتە بەر چاومان • بەڵام واژەی زیندوولە بە بڕوای من ، هەموان دەگرێتەوە • چاك و خەراپ ، تەنیا لاسار و پیس ، وەبەر چاو نایە •

ـ بەڵێ وایە • میکرۆبیش بە مانای زیندەوەری وردە کە تەنیا بە چاو نابیندرێ • بەڵام چونکە هۆی زۆرتر لە نەخۆشی و ، ئاهۆ و ئازارانە ، بۆیە وا بەدناوە ، با بڕوانینە مێژووی میکرۆبیۆلۆژی ، تا بزانین چلۆن دیاری کران و ناسران ، کە ئەمڕۆ وا بە کار گیراون •

کاتێك ، ئانتۆنی وان لیوێن هۆك لە ساڵی ١٦٧٣ زایینی ، میکرۆسکۆپێکی زۆر ساکاری ساز کرد • هەر چەند تاجرێکی هولەندی بوو ، بەڵام زۆر شیفتە و شەیدای سەرنج دان و لێکۆڵینەوە بوو • هەر چی دەهاتە بەر چەنگی ، بە زەرڕەبینەکەی لێی ورد دەبۆوە •

کاتێك دڵۆپێك ئاوی گۆلێکی تەماشا دەکرد ، دیتی ، پڕە لە زیندەوەری جۆراوجۆر : درێژ ، کلك دار ، کۆپەڵە ، مارپێچ ، پانکەڵە ••• کە وەك هەزارە زیلە دەجووڵێنەوە •

بەڵام ، ئەم واژەیەم پێ سەیر بوو • چۆن بوو بە سەر زارت داهات ؟

ـ بەڵێ تا ئەو دەم گیاندار و زیندەوار ، هەر ئەمانە بوون کە دیترابوون • یا لێیان دیار بوو • شتی زۆر ورد دیاری نەدەکرا کە زیندوون یا مردوون یا تەنانەت بێگیانن • لام وایە بە زیندەوەری زۆر ورد دەگرێ بڵێین زیندوولە • باشە چۆنت پێ باشە با وا بێ • ئەمن کە پسپۆڕی زمانەکەمان نیم •

ـ دەبێ تێکۆشین ، فێربین •

ـ (کەڕاوە سەر مەبەستی باسەکە ) لەم کاتەوە کە بەنی ئادەم هاتۆتە سەر دنیا بۆ ژین و خۆ پاراستن ، لە دەوروبەری خۆی رواتیوە • سەرنجی داوەتە گیاندار و بێ گیان بە ئەسپایی بە هۆی ناسین و ئاگاداری، توانایی خۆی پەرە پێداوە ، بۆی روون بۆوە چ جیاوازای یێك بەینی گیاندار و بێ گیان هەیە • دیتوویەتی هەر گیاندارەی ، لە گیاندارێکی چەشنی خۆی دەبێ • لە خۆڕا هیچ گیاندارێك پەیدا نابێ •

ـ بێ گومان ، هەوڵ دان ، لێکۆڵینەوە و سەرنج دان ، بۆتە هۆی پێش کەوتنی گەل • وا دیارە زۆر زوو چلۆنایەتی و چەشنی ژینی زیندەوار • بۆ مرۆ روون بۆتەوە •

تەنانەت سێ باسای زۆر بەر چاوی چلۆنایەتی ژینی زیندەوار بۆ مرۆ روون بۆتەوە

ـ مەبەستت لە سێ باسای بەر چاو چیە ؟

١ ـ پێویستی ژین ـ زیندەوار و گیاندار ، بۆ درێژە دان بە ژین ، هەوا و ئاو و خواردەمەنی گەرەکە •

٢ ـ زیندەوار ، هەڵدەدا ، زل دەبێ ، تا دەگاتە تەمەنی زاوزێ •

٣ ـ مردن ـ هەر زیندەوەرێك پاش ماوەیەك ، ژین ، زۆر یا کەم دەمرێ •

ـ بەڵێ وایە • شتی بێ گیان تەنانەت ئاڵووگۆڕیشی بە سەردابێ ، ئەم سێ قۆناغە نابینێ • بەڵام شتی زۆر ورد ، وەك نوختەیەك بێ هۆکار تەنانەت میکرۆسکۆپ بۆ لێکۆڵینەوە دەس نادا •

شوان (کە چای دەم کردبوو) چایەکی لە پێش من دانا • شێرکۆ قەندانەکەی راگرت و داوای لێ بوردنیان لێکردم • کوتم گوێتم داوەتەدەمەتەقەی ئێوە • پێم خۆشە• شوان دەستی پێکردەوە و گوتی :

ـ کاتێك ئینسان بۆ تێر کردنی زگی و پاراستنی خۆی هەدادانی نیە ، هەل و مەرجی وەی نابێ سەرنج بداتە شتی وا •

ـ نزیك دوو سەت ساڵ پاش لیوێن هۆك تازە زانایان پرژانە سەر ناسینی میکرۆبان • تەنانەت ئەودەم میکرۆسکۆپی زۆر باشیان ساز کرد کە پتر لە دووهەزار کەڕەت شت زل دەکاتەوە •

ـ لە سەدەی رابردوودا ، بە هۆی میکرۆسکۆپ ، لە ئەندامی دار و درەخت ، گیا و گیاندار ورد بوونەوە • زانیان سێللول ، وردیلەترین ماکەی تەواو زیندووی تەنانەت تا رادەیەك سەر بە خۆی لەشی هەر زیندەوەرێکە •سێللولی هەر ئەندامەش ، چەشنێکە ، کارێکی پێ سپاردراوە •

ـ لە هەوەڵدا لایان وابوو سێللول وەك شانەی مێش هەنگوینە • بۆیەش ناویان نا سێللول • بە

ماناى خانووچكه . سێللول زۆر لە میكرۆب زل ترە . تەنانەت هەى وا هەیە بە چاوی رووت ببیندرێ .

ـ بەڵێ ، سێللولی هەموو ئەندامێك و هەموو گیاندارێك بە یەك ئەندازە نین . سێللول لە ٠/٠٠٥ تا ٠/٢ میلی میتر دیتراوە . سێللولی واش هەیە بە پێی كارەكەی زۆر درێژە وەك سێللولی دەمار . ٠/٢ میلی میتر بە چاو دیاری دەكا . تەنانەت دەتوانین هێلكەش بە سێللولێك دابنێین . بەڵام ماكەی تۆوەكە زۆر وردە . سپێنە و زەردێنە خۆراكی بە نرخی ماكەی تۆوەكەن .

ـ بێ گومان ، دیتنی ماكەی تۆ و بە چاوی رووت ، چە توونە و بێ میكرۆسكۆپ ، سەرەو دەری لێ ناكرێ .

ـ بەڵێ خۆراكی لای ماكە ی تۆ و بۆ هەڵدانی تۆوەكە زۆر پێویستە . بڕوانە هێلكە، كاتێك بخرێتە ناو ماشێنی جووجەڵە كێشی یان لە بن مریشكە كورك دابنرێ ، پاش سێ حەوتوان ، جووجەڵە سەر دێنێتە دەر .

ـ بەڵێ جووجەڵەش خۆی دەتەكێنێ و دەڵێ ئەزیش هەم ! مافی ژین و پاراستنی ماكەی خۆمم گەرەكە !

ـ با گەرەكی بێ ! ئێمەی بەنی ئادەم لە بەر پێویستی ژینی خۆمان وامان ئاگالێیانە بە میلیۆن میلیۆن ، بە هۆی ماشێن لە جیاتی مریشكە كورك ، هەڵیان دێنین و بە خێویان دەكەین . بەڵام ئەمەشت لە بیر بێ لە بەر خاتری چاوی جوانیان نیە كە خزمەتیان دەكەین . بەڵكوو بە خاتری پێویستی ژینی خۆمانە . بە داخەوە ، ئێمەی بەنی ئادەم ، رێی هەموو كارێك دەدۆزینەوە . بەڵام لە بەر خۆ پەرستی و خدەی لاساری داگیر كەری زۆرداران ، رێی ژینی راستە قینەمان لێ بەستراوە . زۆر كەلی لێ قەوماوی دەس بە سەریش هەن كە لایان وایە دەرو جیران خۆشیان دەوێن . بۆیە پووڵ و پارەیان دەدەنێ و پشی پشی یان دەكەن .

برا ، كێ بە هیوای دەر و جیران بە تێری نوستووە ؟

ـ ئەویش جیرانێك ، كە خدەی داگیر كردنی لە باوك و باپیرەوە بە میرات بۆ ماوەتەوە . هەلی بۆ هەڵكەوێ ، سەرت هەڵدەقەنێ .

ـ لە باسەكەمان دوور كەوتینەوە . لە وشەی زیندوو لەو سوغرە كرتنی میكرۆب ، هاتینە سەر چی . باسی كەڕا و تۆومان دەكرد .

ـ مرۆ زۆر زوو بۆی دیاری كرا بوو كە هۆی زیاد بوونی زیندەوەر و گیاندار ، كەڕا و تۆوە . تەنانەت دەشا و منداڵدانیشدا ، تۆوی نێر دەگەڵ تۆوی مێ دەگوورێ . پاشان ، تۆوە گووراوەكە سێللولی وردتری لێ پێك دێ . ئەم گرموولە وردەی كە دەتوانین بڵێین ئێستا ش دیاری ناكا ، لە خوێنی دایكی خۆراكی پێویست وەردەگرێ . وەك ماكەی جووجەڵە لە خۆراكی نێو هێلكە . ماكەی تۆوی گەنم ، جۆ ، نۆك و میوەی دیشی ، لە ئارد و خۆراكی لای ، بۆ گووران كەلك وەردەگرێ .

ـ ماكەی تۆو ، دە نێو دەنكە گەنم دا ، تەنیا لە چاو دیاری ناكا . بەڵام كاتێك تەڕایی بگاتێ هەڵدەدا . چەقەرەی دەر دەكا . ریشە دادەكوتێ . پاش تەواو كردنی ئاردی دەنكە گەنمەكە ، لە ئاو و خاك ، هەواوتا و مایەی پێویستی ژین بۆ هەڵدان وەردەگرێ و پێكی دێنێ . تا دەگاتە تەمەنی بەر هێنان كە بریتی یە لە مزا وزێ .

ـ ماكەی تۆ و زۆر وردە پێویستە بە میكرۆسكۆپ لە چلۆنایەتی هەڵدان و زل بوونی ئاگادار بین .

ـ بۆ نێوانی شتی ورد میلی میتریش درێژە . كاتێك سێللول ٠/٠٠٥ میلی میتر بێ پێویستە میكرۆن بە پێوەر بگرین . میلی میترێك كراوە بە هەزار كوت . هەر كوتەی یەك میكرۆنە .

ـ كاتێك میكرۆسكۆپ ساز كرا ، زانایانی شەیدای لێكۆڵینەوە و ئاگادار لە ئەسراری جیهان ، وەك ئاشقانی جەماڵی یار ، میكرۆسكۆپیان قۆزتەوە ،هەڵیان كوتا سەر ناسینی زیندەوەری ورد كە بە چاو نەدەدیتران .

ماوەیەك رانەبرد ، میكرۆبی هۆی زۆر نە خۆشی دۆزرایەوە . بەڵام هەر چی هەوڵیان دا میكرۆبی هۆی هێندێك نەخۆشی و ئازار وەك هاری و خورولكە نەدۆزرانەوە . تەنانەت بۆیان سەلمابوو كە ماكەی ئەو ئازارانەش دەبێ شتێكی وەك

میکرۆب بێ ، بەڵام بە میکرۆسکۆپی بە کار براو دیاری ناکا • پەنجا ساڵ لەمەو بەر کە میکرۆسکۆپی ئێلێکترۆنی ساز کرا ، هۆی ئەم ئازارانە دیاری کرا کە پێی دەڵێن ویرووس تەنانەت ماکەی لاسار و ژەهراوی •

- میکرۆسکۆپی ئێلێکترۆنی ئامرازێکی بە نرخی ئەم چەرخەیە • تەنانەت چەند سەت هەزار کەرەت شت زل دەکاتەوە • بۆ پێوانی شتی زۆر وردتر میکرۆن کراوە بە هەزارکوت کە پێی دەڵێن نانۆمیتر یا میلی میکرۆن •

- نانۆمیتریانی یەك بنووسە و ٩ نوختەی لە پێش ریزکە تابکاتە میترێك ( ١/٠٠٠/٠٠٠/٠٠٠ ) هەر بەم چەشنە زانایانی تێکۆشەری بە شوو . بە لێکۆڵینەوەی بێ وچان ، رۆچنەیەکیان بەرە و جیهانی ورد یلە و زیندوولە کردەوە کە بە راستی جیهانێکی سەیر و سەمەرە و سەرنج راکێشە •

- بۆ وەی ئەم ئەندازانە لە بەر چاو بگرین ، دەنکەیەك لیمۆ یا رەڵم بێنە بەر چاو کە یەك میلی میتر بێ • سندووقێکیش لە بەر چاو بگرە کە یەك میتری موکەعەب بێ ( پانیی و بڵێندی و درێژایی یەك میتر ) •

- ( بە گاڵتە ) ، ناکا پڕیان کەی لە لیم •

- سندووقەکە بە یەك بیلیۆن یانی یەك میلیارد دەنکە لیم پڕ دەبێ یانێ یەك بە تەوانی نۆ ( $١^{٩}$ ) بە زبانی ریازی •

- بەڵام $١٠^{٩}$ سندووق



کێویکی لێ پێك دێ بە درێژایی و پانی و بڵێندی یەك هەزار میتر ئەم کێوە $١٠^{١٨}$ دانە لیم دەبا •

- یانی یەك بنووسە و ١٨ نوختەی لە پێش ریز کە • ( شوان بە گاڵتە ) ، لیم لە وەلات دەبڕێ • دەبێ بچینە وەڵاتی ئارەبان !

- با میکرۆبەکان ببینین !

ئەوان دەو قسانەدا بوون •

منیش خەو نووچکە دەیبردمەوە •

بە خۆم نەبوو شەو نەنوستبووم • هەمووی دەرێکادا بووم • دەنا و ماشێن دا خەوم لێ ناکەوێ • هەر سێکمان لە سەر کۆڵانەکە وێستا بووین • دەمانڕوانی بە جیهانی زیندوولەکان • کوتم وا باشە بە کۆڵانەکەدا بڕۆینە خوار • هەر وام کوت و لوور بوومەوە • خۆم زۆر لەوان پێ ئازاتر بوو .کوتم مەترسن دەچین چاومان پێیان بکەوێ • خۆ ئێمە ئیستیعمار کەروداگیرکەر نین ، وەلاتیان لێ زەوت کەین • تەنانەت ئێمەی رووتە و پووتەڵە لە درێژایی مێژووش دا هەرگیز داگیرکەر نەبووین • شێرکۆ لە پڕ گوڕاندی ، ئەوەتا ! ئەو تۆپەڵانە! ئەندازەیان یەك میکرۆنە • ( $١٠^{٩}$ ) لەوانە بە قەرایە دەنکەیەك لیمە • $١٠^{١٨}$ لە وانە دەکاتە سندوقێك • شوان کوتی کێوێك لەکوێ وسندووقێك لە کوێ •

شێرکۆ کوتی بڕوانە کۆڵانەی میکرۆسکۆپی ئێلێکترۆنیش دیارە • هەروای کوت و لوور بوومە خوارێ • ئەوانیش زۆر بە ترس و لەرز داخزان • کوتم مەترسێن با لێك بڵاو نەبینەوە باشترە • وا دیارە ئەم ویرووسانە زۆر لاسارن شێرکۆ لە پەناوە چاوی لێ زیت کردبوونەوە • کوتی ئەی یەك میلی میکرۆنیان تێدانیە • شوان کوتی بڕوانە هۆ و خڕکەڵانە ! وا دیارە هی فەلەجی منالی یە • شێرکۆ کوتی ئەوانین لە یەك میکرۆن زل ترن • بەڵام ئەمن کوتم تەماشای ئەردی کەن ، لیمێکی چەند وردە • شێرکۆ کوتی بە بڕوام هەر دانەی ئەم خاکە یەك میلی میکرۆنە• شوان کوتی ئەژمارەکەمان وایە : ( $١٠^{٩}$ ) لەو لیمە بە قەرایە ( $١٠^{١٨}$ ) بە قەرایە دەنکەیەك لیمی سەحرایە ! کێوێك لەکوێ ودەنکە لیمێك لە کوێ • بەڵام ئەمجار من ترسم لێ غالب بوو • کوتم ئەم ویرووسانە زۆر سازن • تا لێمان دردۆنگ نەبوون و نەکەوتووینە بەر پەلاماری پرسیاریان هەڵکشێینەوە دنیای خۆمان •

**درێژەی هەیە**

# قوتابیانی سەرکەوتوو



تاهیر ئەسافی
پۆلی یەکەمی سەرەتایی
مەعدەل: ٢٠
سەقز: مەدرەسەی بووعەلی



پرشنگ ئەمیری
پۆلی چوارەمی سەرەتایی
مەعدەل: ١٩/٥
سەقز: مەدرەسەی هیجرەت



ئەنوەر مام ئەحمەدی
پۆلی پێنجەمی سەرەتایی
مەعدەل: ١٩/٨٧
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



نەسیم عطیار
پۆلی یەکەمی سەرەتایی
مەعدەل: ٢٠
ورمێ: مەدرەسەی نیلووفەر



عەبدوڵڵا ئاتەش بەستە
پۆلی سێهەمی سەرەتایی
مەعدەل: ١٨/٨٦
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



عەزیز حوسێن زادە
پۆلی سێهەمی سەرەتایی
مەعدەل: ١٧/٩٥
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



جەعفەر حەیدەرسانی
پۆلی یەکەمی ناوەندی
مەعدەل: ١٩/٢٢
بۆکان: مەدرەسەی شەهیدنەججاری



ئیلهام حافزی
پۆلی یەکەمی سەرەتایی
مەعدەل: ٢٠
سەقز: مەدرەسەی مەردووخ



فارووق محەممەدزادە
پۆلی دووهەمی سەرەتایی
مەعدەل: ٢٠
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



ئیسماعیل چاک
پۆلی دووهەمی ناوەندی
مەعدەل: ١٨/٥٨
بۆکان: مەدرەسەی شەهید نەججاری



مەنسوور شوعبانی
پۆلی یەکەمی ناوەندی
مەعدەل: ١٨/٢٤
بۆکان: مەدرەسەی شەهیدنەججاری



سولەیمان دوکاندار
پۆلی دووهەمی سەرەتایی
مەعدەل: ٢٠
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



قادر عابیدی
پۆلی سێهەمی ناوەندی
مەعدەل: ١٧/٦٢
بۆکان: مەدرەسەی شەهیدنەججاری



محەممەد محەممەدپوور
پۆلی پێنجەمی سەرەتایی
مەعدەل: ١٨/٢٧
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



ڕەحمان ڕەحمان نیژاد
پۆلی پێنجەمی سەرەتایی
مەعدەل: ١٩
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



ئیبراهیم کەریمی
پۆلی سێهەمی سەرەتایی
مەعدەل: ١٩/٨٣
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



عەلی فاروقی
پۆلی دووهەمی سەرەتایی
معدل: ۲۰
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



محێدین مام ئیبراهیمی
پۆلی یەکەمی ناوەندی
معدل: ۱۹/۲۳
بۆکان: مەدرەسەی شەهید نەججاری



ئەمیر شەریف زادە
پۆلی دووهەمی سەرەتایی
معدل: ۲۰
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



عوسمان ئازمەند
پۆلی دووهەمی سەرەتایی
معدل: ۱۸/۷۴
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



ئەمیر کوردە
پۆلی یەکەمی ناوەندی
معدل: ۱۷/۶۳
بۆکان: مەدرەسەی شەهیدنەججاری



سەلاحەدین ئەندەروا
پۆلی یەکەمی سەرەتایی
معدل: ۱۹/۹۱
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



ئیسماعیل غەفووری
پۆلی یەکەمی ناوەندی
معدل: ۱۸/۹۸
بۆکان: مەدرەسەی شەهیدنەججاری



لوقمان کامووسی
پۆلی چوارەمی سەرەتایی
معدل: ۱۹/۰۳
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



میکایل محەممەدی
پۆلی چوارەمی سەرەتایی
معدل: ۱۹/۴۶
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



رەحیم حوسێنی
پۆلی سێهەمی سەرەتایی
معدل: ۱۸/۸۶
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



خزر شەریف زادە
پۆلی یەکەمی سەرەتایی
معدل: ۱۸/۹۱
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



ئیبراهیم ئالی
پۆلی چوارەمی سەرەتایی
معدل: ۱۸/۸۲
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



رەحمان مام ئیبراهیمی
پۆلی یەکەمی ناوەندی
معدل: ۱۷/۶۳
بۆکان: مەدرەسەی شەهیدنەججاری،



رێبوار قادری
پۆلی یەکەمی سەرەتایی
معدل: ۱۹/۷۵
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



عەبدوڵڵا مەحموودزادە
پۆلی دووهەمی ناوەندی
معدل: ۱۸/۵
بۆکان: مەدرەسەی شەهید نەججاری



رەزا حوسێنی ئەسڵ
پۆلی پێنجەمی سەرەتایی
معدل: ۱۹
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا

پێ لەبەرچاوناگیرێ ونەزمەکەشیان بەرێکی نایەتە روو. ئەو بەرێزانە کەلەسەرەتاوە لەوچوارچێوەیە تۆقیون هەتا لێی رادێن وبەسەریدا زاڵ دەبن ماوەیەکی زۆر دەکێشێ و جائەودەمیش خودا دەزانێ عادەت بەوە دەکەنەوە کەوەك شتێکی فەرعی چاولەوەزن وقافیە بکەن یانا ؟ بەڵام هێندێك لەلاوەکان بەپێچەوانە لەسەرەتاوە بەزمانی شێعروهەستی شێعروعاتیفە و ئەوخاڵە گرینگانەی شێعرەوە دەنووسین وزۆردەربەندی وەزن وقافیە نین. هەرچەند شێعری دەستەی دووهەمیش بێ کەم وکووری نیە ودیارە شکاندنی وەزن ونەبوونی قافیە لەشێعری کلاسیکدا وهەروەها شکاندنی وەزن لە شێعری نوێ دا لەباشی شێعرەکەیان کەم دەکاتەوە ، بەڵام بەلای ئێمەوە کاری دەستەی دووهەم پیرۆزترە ، بۆ ؟ چونکە کەسێك کەمایە وجەوهەری شێعری ببێتە کەرەسەی سەرەتایی نووسینی شێعر ، دیارە زۆرتربەرە و دنیای داهێنان وخولقاندن هەنگاو دەنێ وداهاتووی خۆی لەوەدا دەدۆزێتەوە کە لەسووژە ونێوەرۆك ورد - بێتەوە ، کەسێك کە ئەورێگایە هەڵبژێرێ لەومەودایەدا هەڵەی وەك وەزن وقافیەش دەدۆزێتەوە و پاش زۆربژار و هەڵس وکەوتی دیکە دەگا بەوپلەیەی کەپێویستە شاعیرێك پێی بگا ، بەڵام ئەوکەسەی کەزۆرترلەفکری وەزن وقافیەدایە ئەگەر سەرکەوتووترین کەس بێ لەو بوارەدا تازە دەبێتە نازم کەدەگەڵ شاعیر هەرخودایان یەکە. ئێستا بۆئەوەی باسەکەروونتربێتەوە دوونموونە دەخەینە بەرچاو بۆ دەستەی یەکەم یانی ئەوانەی لەسەرەتاوە زۆرتربەوەزن وقافیەوە نووساون.بابڕوانینە بەشێك لەشێعری کاك ع . ئ لەشاری سنەوە :

**بەهار هاتەوە زیندەگی تازە**
**کێ سەردەردێنێ لەم رازو نیازە**

**بەهار سەرەتای وەرزی گوڵانە**
**بەدی هاتنی هیوای دڵانە**

**گوڵاڵەبەرێز لە خاك سەردەنێ**
**مزگێنی ژینی دووبارە دێنێ**

**بولبول لەدووری گوڵ ئازاد ئەبێ**
**بە پێکەنین گوڵ دڵی شاد ئەبێ**

ئەوشێعرە هەرچەند لەباری وەزن وقافیەوە کزنیە

بەڵام ناتوانین ناوی شێعریشی لەسەر دانێین ،چونکە هیج قسەیەکی تازەی پێ نیە، هێندەمان گوێ لەو شێوە شێعرە بووە کەئیتر توانای خوێندنەوەیشمان نەماوە. یانی وەزن وقافیە نەیانتوانیوە ئەونووسراوە- یە لەبەرچاوی ئێمەبکەن بەشێعر ، لە حاڵێکدا نووسەرەکەی ئەوەندی بایەخ پێداون کەبۆ وێنە لە جیاتی ئەوەی بنووسێ "گوڵاڵە لەخاك سەروەدەردەنێ " نووسیویە "سەردەنێ" یانی مەسدری ئەو فێعلەی کە "سەروەدەرنان "ە گۆڕیوە.

بەڵام سەرنج بدەن بەشێعری یەکێك لەدۆستانی شاعیرمان بەناوی کاك نادر نیروومەند. ئەم بەرێزە لەسەرەتاوە زۆرتر بایەخی بەناوەرۆك وسووژەوتازە بوونی بابەت دەدا هەتا وەزن وقافیەو.... ئێستاش لەهێندێك لەشێعرەکانیدا جوانترین وێنەی شێعری دەخولقێنێ ودڵنیایین داهاتوویەکی رووناك چاوەڕوا- نیەتی. ئەوەش شێعرێکی ئەوبەرێزە :

**تۆبلێی خۆری نیگای گەرمی چ دڵسووتاوێ**
**دای گزنگی لەسەر ئەو روومەتی بەفرەت تاوێ**

**وارەشانگێ لەوێ پەیدابوو لەگوێن خاڵێکی رەش**
**ئێستەکەش چەشنی "بەرۆژ" دەگری نیگای هەرچاوێ**

یانی ئەوشاعیرە کەلەسەرەتاوە رێگاکەی بە چاوێکی ئاوەڵاوە هەڵبژاردووە ، بەسەرکەندوکۆسپە - کانیش کەلە قالبی وەزن وقافیەدا خۆیان نواندووە ، زاڵ بووە . بەڵام ئەوبەرێزەی لەپێشدا باسمان کرد زۆرتر پاراستنی وەزن وقافیەی مەبەست بووە وهەر بۆیەش نەیتوانیوە شێعرێکی سەرکەوتووپێشکەش بکا .









تێبینی : لەپڕکردنەوەی ئەم جەدوەلە داهەسوو ئوسوولی کوردی بە پێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە ڕەچاو کراوەجگە لەوەی نیشانەی ( ۷ ) دانەنراوە، واتائەگەر بۆوێنە وشەی ( شڕ .کۆڵ .ڕۆڕ . شێر .و٠٠٠) ی تێدابێ بەشکڵی ( شر .کول .رور . شبرو ٠٠٠ ) دەنووسرێ ٠



١- شاعیری بەناوبانگی شاری سەقز ٢- بووکی سنەیی لێهاتوو .شیاو - قسەوفەرمانێك کەئەنجام دانی باش بێ ٣- خوازنی جوانی - ئەوبزگورەی لە دەوروبەری نینۆك لەکۆشتی قامك هەڵدەستێ وزۆربەئێشە - بەسەرچاودەکشێ ٤- "یارد"ی تێکەلاو - مەلی پەڕ نەخشین ٥- دەنگێکە بۆ بانگ کردنی ماڵات وئاژەڵ - ڕووناکی - ترسێنەرێکی خەیاڵی وەك "ئاڵ" - کیژ ٦- لەو لاوەڕادەخورێتەوە-شێعر - ئەژنۆ ٧- ناوی پێغەمبەرەکەی ناوزگی ماسی - لەوەڕاندنی مەڕبەشەو- دۆڵ ٨- سەدبەزمانی ترکی - کوێندەرێ - سایەی لەسەرمنداڵ کەم نەبێ ٩- قاشێك لەکاڵەك یاشووتی یابەشێك لەزەوی - تەنافی دەزوو ١٠- "کەم"بووکەمتریش کر! - مەکتەبێکی سیاسی- ژمارەیەکە ١١- خەڵك" بە عەرەبی - کارێکی خراپە وپیاوی ئازاخۆی لێ دەپارێزێ - ئەگەر ژنی تێدانەبێ بەرێوەناچێ ١٢- "جیکن"بووتێکەڵ کراو شێوا - دمی ماڵاتێ کێرەی پێ دەبەستن- ناوچەیەکی شیمالی کوردستانی ئێران ١٣- ئامرازێکی مۆسیقا - لەو لاوەڕا زۆررەشە ٠ - قووت وبژیو ١٤- کۆی "وڵات" - بۆنی سووتان وهەڵقرچان ١٥- ڕووت کردن وجەردەیی لێر و لەوێ - ئەخلاقێکی خراپە ٠

١- نەنگ .کاری عەیب - نەخۆش ولەش بەبار بە فارسی بەنووسینی کوردی ٢- پووڵی ژاپۆن - حەکایت بێژی فارسی - پێتەختی فیلیپین ٣- "کڵاوخوودی بێ کڵاو- نەوسنی چاوبرسی - لافاو ٤- ئارا - لە ولاوەڕا زۆرساف - مەلێکی هێمن وئاشتی خواز ٥- لەبەردەست دایە٠ زیزو دلگیر - هەمووهەمانە ٦- شتی بڵاو کە چاك نانیشێتەسەریەك - جێکەی لەدایکبوونی نیما - ناوێکی ژنانە- ژمارەیەکە ٧- وەوبیرهێنانەوە- ئەسپی پێ‌نیمار دەکەن -"ملار"ی تێکەڵ ٨- زانست بەعەرەبی بەنووسینی کوردی - بۆکۆمەڵ جێکەی هومێدە ٩- نۆبەتێ - زەماوەند- لێهاتوو ١٠- جێ ناوی یەکەم کەسی تاك - قاڵی دروست کردن - دژی تاڵ - بۆچی ١١- شارێکی سەرسنووری ئێران و عێراق - تێرئاکای لەونیە- دژی درەنگ ١٢- درەوشانەوەی ئەستێرە- هەمیشە - تایفەیەك کەبەعەتڵ سووکی بە ناوبانگن ١٣- هەستان (زۆرتردەکەڵ "کەوت"دێ)- شتی لاروخوار- بەشێکی براوە لەدار ١٤- هاواری‌دەرویش - مریشك وباڵندەی سەرهێلکە - بێ دەسەڵاتی وچارەرەشی ١٥- هاتووچۆکردن وبیرکردنەوە لەهەمان کاتدا- شارێکی خاپوورکراوی کوردستانی عێراق٠



پڕکراوەی جەدوەلی ژمارە ٥٦

بەرەندەی جەدوەلی سروەی ٥٣

کاك بارزان عەبدوڵلا ئەحمەد لە سەردەشتەوە

بەرەندەی جەدوەلی ژمارە ٥٤

کاك سامرەند کامرەوا لە سەقزەوە





# فێربوونی مۆسیقا

ئامادەکردنی محەمەد حوسێن بەرزین



لەبەشی دووەمی فێربوونی مۆسیقا دا دەگەڵ مانای ریتم ئاشنابووین وزانیمان کە کێش وریتم لە دەکار هێنانی دەنگەکان وبێ دەنگی یەکان (سکوتها) دەگەڵ بایەخەکانی زەمانی جۆراوجۆر پێک دێ ٠ هەروەها دەگەڵ حەوت شێوەی دەکارهێنانی نۆتەکان لەباری مەودای زەمانی یەوە ئاشنابووین ٠ لە درێژەی باسەکەماندا خەریکی شی کردنەوەی بێدەنگی یەکان دەبین ٠

**بێدەنگی یەکان "سکوتها" :**

بێدەنگی یەکانیش وەك دەنگەکان لەهۆیەکانی بەرچاوی پێك هاتنی ریتمن وەك وی لە باری مەودا و درێژەی زەمانی (امتدادزمانی) بە حەوت شێوە وەك نموونەی خوارەوە دەکار دەکردرێ ٠

بێدەنگی خڕ · بێدەنگی سپی · بێدەنگی رەش · بێدەنگی چەنگ · بێدەنگی دوو لاچەنگ · بێدەنگی سێ لاچەنگ



٤زەرب · ٢ زەرب · ١ زەرب · $\frac{1}{2}$ زەرب · $\frac{1}{4}$ زەرب · $\frac{1}{8}$ زەرب

هەربەوشێوەیە کە لە وێنەکەدا دیارە بێدەنگی خڕ موستەتیلێکە کە لەژێرەوەی هێڵی چوارەم هەڵکەوتووە و بێدەنگی سپی لەسەر هێڵی سێهەم وبۆبێدەنگی یەکانی تر جێگەیەکی دیاری کراولە سەر هێڵە هەڵکرەکان وەبەر چاونایە٠

ئەگەر ئاهەنگێك پێویستی بەیەك (میزان) بێ بەوشێوەیە دەنووسرێ :

ئەگەر ئاهەنگێك پێویستی بە پێنج (میزان) بێ بە وشێوەیە دەنووسرێ :

بۆ نیشان دانی بێدەنگی یە ماوەدارەکان لە موستەتیلێکی ئاسۆیی کەلك وەر دەگرن کەلەسەرەوەی ژومارە-یەك کەرادەی میزانەکانی بێدەنگ نیشان دەدا دادەندرێ٠




نموونەی (١٣) · نموونەی (١٤) · نموونەی (١٥)

بێجگە لە حەوت وێنەی دەنگ و حەوت وێنەی بێدەنگ چەند عەلامەتێکی دیکەش بۆنیشاندانی مەوداکانی (کششهای) پێویست لەمۆسیقا دا دەکاردێن کە بریتین لە:

ئەلف هێڵی یەکێتی (اتحاد) ( Tie Bind )

هێڵێکە کەوانی کە لە سەروو یالە خوارووی دوو نۆتی هاودەنگ دادەندرێ ومەودای ئەودوونۆتە بەیەکەوە دەنووسێنێ **نموونەی ١٦:**



**ب ـ هیلی بەیەکەوە نووساندن( اتصال )** ( slur ) هێڵێکە کەوانی کە لەسەریا لەخوار دوویاچەند نۆتی غەیری هاودەنگ دادەندرێ ودەنگەکانی وان بەیەکەوە دەنووسێنێ لەسازە سیمی یەکاندا (ویەلۆن - کەمانچە) ئەو نۆتانە بەیەك (ئارشە) ولەسازە بادی یەکاندا (فلووت وتووزەلە) **و** ئاوازبەیەك نەفەس لێدەدرێ.**نموونەی ١٧:**



**ج - نوختە:**

هەرکات نوختەیەك لە لای راستی دەنگ یابێدەنگێك دابندرێ مەودای زەمانی ئەودەنگ یا بێدەنگە نیوبەرابەر زیاد دەبێ.**نموونەی ١٨:**



**د- دوو نوختە :**

هەرکات دوو نوختە لە لای راستی نۆت یابێدەنگێك داندرێ نوختەی هەوەڵ بەقەدرایی نیو ونوختەی دووهەم بەقەدرایی یەك لە چوار (ربع) بە بایەخی مەودای ئەونۆت یابێدەنگە زیاد دەبێ. **نموونەی ١٩:**

ئەگەر نوختە لەسەریاژێری نۆت دابندرێ نیوەی بایەخی زەمانی ئەولێدەدرێ وپاش ماوەکەی دەبێتە بێدەنگی بەو لێدانە وعەلامەتی ئەو( stecato ) یا موقەتەع دەڵێن. **نموونەی ٢٠:**

ئەگەر هێڵێکی کورت لەسەرەوەی نوختەی سەرەوە یان لەژێرنوختەی خوارەوە دابندرێ ویان خەتی(اتصالی ) لەسەر چەند نۆت( کەسەرەوی ئەوان نوختەی هەیە) دابنرێ سێ لە چواری بایەخی زەمانی هەرکام لەنۆتەکان لێدەدرێ وپاش ماوەکەی دەبێتە بێدەنگی . بەو لێدانەو عەلامەتی ئەونیوە موقەتەع یا ( Mezzostecto )

دەلێن  نموونەی ٢١:

(نۆتە)

ئەگەر ئەو عەلامەتی (٧) لەسەرەوە یاخوارەوی نۆت دابنرێ یەك لە چواری بایەخی زەمانی ئەونۆتە لێدەدرێ و پاشماوەکەی دەبێتە بێدەنگی.

بەولێدانە وعەلامەتی وی دەلێن پێش مرقەتەع یا (slacca tissimo) نموونەی ٢٢:

(نۆتە)

پاشماوەی شاعیرانی کورد

زانووی دڵ ئازاد نەزنجیر دەرد
نەی دەمداکێ بۆیاران هامفەرد

کێن جەفای زاتیش یەکسەر لووابۆ ؟
دلبەر وەبارەی وەسل بالای تۆ ؟

سیوای من- ئاهووی دڵ جە مۆبەت کەیل !
فیدات بم سەد جار ساحیب وەفاومەیل

* * *

های فەلەك دیان چەرخی وەردەوە
تەن وەتۆی یانەی مەینەت بەردەوە

باد موخالیف بەخت ئاوەر دەوە
کەشتی دڵ نە بەحر خەم گوم کەردەوە

پەی چێش چەندێ بێ چەنی نیکاربیم
دەروون شاد ئازاد دڵ بێ ئازاربیم

سوبحم شام سوحبەت سەبووحی دلبەر
شام مەشام وەبۆی موشکین موعەتەر

بێ خەبەر جە فەسڵ فەسڵ جەیران بیم
جە تەمکین قین فەلەك حەیران بیم

نەزانام کارش گردحیلە سازین
حالاتش سەرجەم فیکر بە دوازین

کەیف وەسڵم کەید فەلەك بەرد جەزەین
جەناکافیراق ئەبەد وست ئەوبەین

سافەلەك هەنی چەنیت چێش واچوون
دوعای من دایم کەرۆت سەرنگوون !

* * *



شەهلا ئامانی
پۆلی یەکەمی سەرەتایی
مەعدەل : ٢٠
سەقز : مەدرەسەی سومەیە



جمال ناسری
پۆلی چوارەمی سەرەتایی
مەعدەل : ١٨/٨٤
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



بایزید پرخوو
پۆلی پێنجەمی سەرەتایی
مەعدەل: ١٨/٨٤
بۆکان: مەدرەسەی شوهەدا



هێرۆ وەیسی
پۆلی سێهەمی سەرەتایی
مەعدەل : ١٩/٣١
ورمێ ـ مەدرەسەی مائیدە



کولسووم حاتەمی
پۆلی دووهەمی سەرەتایی
مەعدەل : ١٩/٧٢
ورمێ :مەدرەسەی روقیە



عوسمان سەعیدی
پۆلی :یەکەمی سەرەتایی
مەعدەل : ١٧/٥۴
بۆکان:مەدرەسەی شوهەدا



# پەندی پێشینیان

* نفی خۆی قووت داوه ·
* ئەرسی خۆی گێره دەکا ·
* بفری نه فری هەربزنه ·
* بەبێزینگی بەری رۆژێ ناگیرێ ·
* کەرویشك چەند ئەنوێ ،ئەوەند-ەش دەبەزێ ·
* کۆلکەمه لادینێ دەبا وکۆلکه تەبیب گیانێ دەبا ·
* کۆچك لەئاگرگەرمتره ·
* تۆله بەتۆله قازانجی زۆره ·
* بەسەبر بەوبەزەبربه ·

**"شنۆ- مەقسوودمحەممەدئەمین - زاده"**

* پیاوی پیرقاچی ئەبێ بەسێ ·
* قەند یان نیه چای لێ دەنێن ·
* خۆ شەمامه نیه بۆنی کەم ·
* چوونی هەبێ وهاتنەوه نەبێ ·
* کەهاتم بوو هەرهاتم بوو و کەنەهاتم بوو رووی تاریکم بوو ·

**"بۆکان- برایم رەحیمی"**

* ئاشەکه شلەبێ ،ئاشیەزەکه بلەبێ ، هەرکەس بیخواگول دەبێ ·
* هەرئەمەیه لەبەرما لەمال قوردەکەم بەسەرما ·

**"سنه- جەعفەر میرەکی"**

* چاکه وخراپه قەت ناچێ لەناو ون نابێ گەربیخەیته نێو ئاو ·
* خۆشه تەنافم بچێته ملی نەك بەخێوم کەن بەلارەملی ·
* کەرەم کێش بەزۆری بزانه زیاد ئەبێ نیعمەت بەهۆی شوکرانه

**"سەردەشت :- محەممەد مەلائی - نیسکۆلانی "**

* له جل وبەرگی کاکەسوار ی لەکەلاشەی دووکانداری گەبشته تال وبزماری ·
* بۆتەکەری نیوجێکەی ·
* دەعبای درنده سوێند خۆران لێك دەکا ·
* چەنکد چەنگی هەیاس،سم سمی خەره ·

**"پیرانشار : سەلاح سەیدمحەممەدی"**

* پەلەمەکه بازەرەرنەکەی ·
* بەدرۆفر مێسك هەلمەوەرێنه ·
* کەروئاسکیان نەگوتووه ·
* بەخەیال مندال مەترسێنه ·
* هاوریێی خەراپ تووشخەرابەت دەکا ·

**"ورمێ :سەدیق ئاوەندی"**

* فکربکه وقسان بکه ·
* وشتربەوزەلامی یەی سەر ی دەبن قانگه لاشکێ دەنادەبگوت کەس نامبینێ ·

**"شنۆ : زێنەب پردئابادی"**

* باوك مردووئەیکا ،نان وگۆشت خۆر ئەیخوا ·
* بەرات بەرات ، هەرچی هات ·

**"مەهاباد :ئازاد مەلاقادر "**




۴۵- مەتەلێکم هەیه پێنج پیته
لە ئارد دایه وبێ پیته
پاش و پشتی وەك بەکه
ئەو مەتەلەی هەل بێنی
دیاره هونەر ئەنوێنی ·

**"بانه: زاهید محەممەدیان"**

۴۶- من لەکەل دالێ کەوتینەچالێ :
هاتینه دەرێ بۆ کروکالێ ·

۴۷- له پاش قره قروشەره شه پ
پێمان ئەکا قروقەپ ·

۴۸- سەرێکی هەیه ودوودەست وپا
خولان ئەخوا وەکوو دەعبا
لەخەوهەستێ بەرێدادەروا ·

**"سەقز حوسێن فەرزانه"**

۴۹- مریشکی جەنکی جەنکی
هێلکه دەکاپربه چەنکی ·

۵۰- مەتەلێ حەوت پیت زەنکی
کلاوسەوز ، ئاوناخوابەرپێی تا
نەکەن به حەوز ،
ئەمیش هەر دەس رەنجی جووتیاره
کێ ئەیکاوکێی تربۆی ئەخوادیاره ·

**"بانه :زاهیدمحەممەدیان"**

۵۱- دوو حەوزم هەیه پرله
ئاوی کەش ·
لەناویان هەلکەوتوودووکەشتی دەرەش
دوکەشتیوان بەرەنکی دووکەل
دنیادەکێلن عەربەوێنەی کەل ·

**"مەهاباد: خالید حەسەن زاده"**

۵۲- شل ونەرمه بێ مووه
لەنێو ئاودا زیندووه ·

۵۳- دێوه رەشەی ئاسمانه ،
چاوی پرله کریانه ·

**"بۆکان :حوسێن غەریبی"**



# قسەی گەورە پیاوان...

* وێژە، هۆی ژیان ومانەوەی هەرنەتەوەیەکە.

"دکتر ویکتۆر پوشە"

* ئەوین یانی سەرکەرمی مرۆڤی بێ ئیش وکار. "ناپلئۆن"

* ژین وژیان شتێکی خودایی‌یە ئەوینیش خەیا لاتی ئەوە.

" ئالفرد دومۆسە"

* بێدەنکی لە زاناوتەزان جوانەکە عەیبی نەزانی دادەپۆشێ وزاناش جوانتر بەرچاو دەخا.

" محەمەد حیجازی"

* هومێد تۆوێکە، بەختەوەری وکامەرانی لە دڵاندا دینێتەبەر.

"رەبیع ئەنساری "

* هەوڵدە سەبارەت بەخەڵك بەدکومان نەبی، چونکووبەدکومانی جکەلە چەرمەسەری ئەیەدی و وەڕەزی ودڵ ناخۆشی. شتێکی تر بەدی ناهێنێ. "سوقرات"

* ئەکەرشادی یەك بۆئێمە نەماوە، باشترین شادی ئێمە ئەوەیە کە خۆمان شادو بەکەیف نیشان بدەین.

"ویلیام جیمس"

* مرۆڤی بێ ئیش وکارزۆرتر قسە دەکەن. "فەرانسەوی"

* زەماوەند کردن بەشێك لە ژیانە. "ئامریکایی"

* کات بە نرخترین شت لە ژیانی مرۆڤدایە، خەڵك زێڕ و ئاڵتوون وشتی تر پاشەکەوت دەکەن بەڵام بە هیچ جۆرێك ناتوانن کات پاشەکەوت بکەن یاکڕین و فرۆشتنی پێبکەن.

"دکتر مادرن"

* بەڕق وتووڕەیی ناکرێ بەسەر ڕق وتووڕەیی دا زاڵ بی، چونکە ڕق وتووڕەیی تەنیا بە موحیبەت لە ناودەچێ. ئەکەر وایە تووڕەیی بەلەسەر خۆیی ورق وکینەش بە موحیبەت لە ناوبەن وچارەسەر بکەن. "بودا "

* چارە ڕەشی هەموو دەم دەسکەوتی چەوت بیرکردنەوەیە.

"هیتلێر "

* بیرکردنەوە، خەیاڵات، ئاە و نالە، ئارەزوو، فرمێسك هەموویان لەهاورێیانی ڕاستەقینەی ئەوینی ڕاستەقینەن. "شکسپێر "

* مردن بۆرزکاری مروڤ لە دەردوخەم وچارە ڕەشی و زوڵم و زۆری باشترین پشت وپەنایە.

"سادق هدایەت"

* دنیاکتێبێکی جوانە، بەڵام بۆ ئەوانەی ناتوانن بیخوێننەوە بێ کەلکە. "کارلۆکۆلدونی"

* ناهومێدی یەکەم هەنکاوەکە مرۆڤ بەرەو کۆر هەڵیدێنێتەوە. چارە ڕەشترین خەڵکی کەسێکە کە دڵێکی ناهومێدی هەبی.

"بناپارت"

* زەماوەند وەك دەس لەکیسێکی پرماروکەی وایە.

"ئیسپانیۆلی"

* نەبوونی وناحەزی ناشاردرێنەوە. "مەراکشی"

* ئەوین تا ئەوکاتە جێکای ڕێزە کە بە نووسراوەبێ.

"بیرمەیی"

* لەتەواوی قامووسی زاراوەی مرۆڤدا، هیچ وشەیەك باشتر و ڕەوانتر لە وشەی بەرابەری نابیندرێ.

.........



# باشۆ

نووسەر : هێنری لانگ فێلو

وەرگێڕ لە فارسی یەوە : پەرویز جیهانی

ل سپێدە یەك گەرمە هاڤینێ فێدریکۆ وستیایی ل شۆلا ناڤ باغێ خۆ ، ل بەر سیبە را دیوارێ کۆلکێ ل سەر کورسییەکی حشك وزڤر روونشت بوو.

ل سەر سەرێ وی دارا تری یێ باسکێن خۆ ژێك ڤەکربوو. گوشی یێن خۆیە جوان ژۆردا ل سەر سەرێ وی دا دالقاندبوو. چەمێ "ئارنۆ" ل بنتاراوی دا ل ئۆرتاگەلی رابینانی پانەرێ یەك خارو پێچ ، چڤ ددا خۆ وژۆردا دهەرکی. ل هەردوورەخێن ڤی چەمی دا دیواروبرجێن جوانە شارێ فلۆرانسێ دهاتن خوویان.

لێ دیمەنا شارێ فلۆرانسێ دگەل وێ جوانی ومەزناتییا خۆ ، ژفێدریکۆ راگول وکەسەربوو ، بینبەرا ڤی شاری برینێد وی یێ کەون دکۆلا. چوون فێدریکۆ ئەوباژارا گوڕائەڤین ومال وحالێ خودزانی ل ڤی بازاری دابوو کوفێدریکۆمالێ خوەیی پڕ ل رێکا مێڤانداری وشەڤ بهۆرکێن ب هەیت وهووت دابلاو کر. گشتی هەیی ونەییێ خۆ ل رێکا ئەڤینداری یا "مۆنا ژوانا "یێ دا دابادێ ،لێ ل کوتاسی یێ دا ژی نەگەهیشتە مرازێ خۆ ، ئەو فرشتا جوان وبەدەو بوو خارێ جگرێ[*] وی.

لێ فێدریکۆ هێ ژی ل سەر ئەڤینا خوە مابوو ، هێ ژی بیروهزرا وێ دلدارا شۆخ وشەنگ قاسەکی ل سەرێ وی دەرنەدکەت.

فێدریکۆ پاشی وێ هندێ کوداروندارێ خۆ ، مال وحالێ خۆ ل رێکا ئەڤین وهەواسادلێ خوە دا دۆڕاندبوو، پەناهـ ئینابوو ڤێ کەرتە زەڤییا هندك و بچووك کو دواترین پشکا مایی ژقەید وقۆچانێ[*] وی بوو. ل ڤێدەرێ ژبل شۆلا ناڤ باغی و چاندن و پەروەراندنا تنگ[*] وشێنەیان چ دلخۆشی یاوی تونەبوو.

مالا وی بریتی بوو ژکۆلکەك تەنگ وتاری کو بنراخا وێ حەسیلەك کەون وپەرتی بوو.

ل ڤێدەرێ ئێدی هەڤال وهۆگرێن وی یە چاغێ خوەشی و شادی یێ کوشەڤ وروۆژ ل دوو وی دابوون ، نەدهاتن سەراوی. هەرتنێ یادگارەك کووتا[*] خوەشی و هەییا فێدریکۆ ل بال مابوو ، ئەو ژی باشۆیەك بوو کو د رۆژێن تەنێتی یێ دا هەڤال وهەڤدەمێ وی بوو. رۆژێن بەتالی یێ ، یان د جەشنادا ئەو دشاندە نێچیرێ ، داکوو خارەکەك خوەش ژ خوە را ئامادەبکە. پیرەمێرێ بەلەنگاز ودل بکۆل ئێدی گشتی حە ژێك وئەڤینا دلێ خۆ دابووڤی باشۆیێ هوشیار وژێهاتی.

فێدریکۆ گەلەك سالێن دوورودرێژ ب نەداری و تنێتی دگەل ڤی هەڤالێ خۆیە تیژچەنگ ودلۆڤان دا دەرباس کربوو ، ل وێ سپێدە یا گەرمە هاڤینێ ل سەر وی کورسی یێ زڤر ، ل سیبەرا دارا تری یێ دا روونشت بوو سەرێ خۆ دابووسەردەستێ خۆ،بچاڤێن نیڤ ڤەکری ل دونیایا خەون وخیالێن شیرینە خویە بهۆری دا نوقم ببوو ، بیرەوەری یێن وی چاغی وەکە سیبەرەك نەدیارو بینانی خەونە رۆژ کا ل بەرچاڤێ وی را دەرباس د بوون ، ل ڤێژا[*] سەرێ وی داباشۆیێ جوان ، کڕو مات ، بێ هەژو لڤات روونشت بوو ، خەو نانێچیری ددیت.

نشکێڤدا ل خەو ڤەجنقی ، دەنگ ل زەنگلێ

ئوستی یێ وی کەت ، تە دگۆت ڤای دل هەبوو بێژە :
" فێدریکۆ ••• گەلۆ ئەم ئیرۆ ناچن نێچیرێ ؟" :

لێ ل وێ دەمێدا فێدریکۆ قەت ل بیرا نێچیرێ دانبوو ، ئەو د بیرو هزرەك دی دابوو •دەزراتەفەشا جوانە بچووکەکی چاڤ بەلەك وجوان ومت ومات دابوو کو پۆرێن قورووشك داکەتبوون سەرپەلەگوها وبێ ترس و خۆف ل پانەرێ یا باغدا بەرب وی گاڤ رادپیڤا وچاڤێ وی هەر ل باشۆ بوو •

زارۆکێ نێزیکی لێ کرو دەما کو گەهشتەپێشبەری باشۆ ، هێدیکا ڤیژیا وگۆت :

- ئاخ ئەی باشۆیێ خوەشك وجوان ، خازی تو باشۆیێ م بییای ، منێ تو بدای سەردەستێ خوو تو هەلفراندای و ئیجا منێ ل تە مێزە بکرا • دەنگێ شیرینەزارۆکێ ل قونجێ تارییەدلێ فێدریکۆ دا بجورەکی سۆسرەت دەنگ ڤەدا ، تە دگۆت ڤای ل پشت دەرکێد ژەنگۆرییە کاڤلەك کەوندا مقامەکی خەوهینەر وخیا لاوییە تەفبوورا یوونانی بەرگوهێ وی کەت •

فێدریکو سەروی دا زڤری وپرسی : کورکێ جوان ، داییکاتە کێ یە؟ وئیجا هێدیکا دەستێ خۆ ل قورووشکێد پۆرێ وی داشەکر •
کورك هەر ئوسا کومت مابوو ل باشۆ مێزەدکر ،گۆت:

- داییکا من ؟ مۆناژوانایە • تو ناس دکی ؟ ما لامە ل وی خانی یێ مەزن دایە کوپشت ڤان مەرخێن بلند ل وی ئالی زەڤی یا وەکەتییە •راستی تو رێ ددی من کوئەز ڤرا بمینم ودگەل ڤی باشۆیێ جوان بلەیزم ؟

زارۆکی قسە دکر وفێدریکۆ ژی ب هەواس و حژمەکاری هەر پەیڤەك ژگۆتنێن وی ل بیرا خوە دا بەرەڤ دکر و لناڤ بیروهزر وخەون وخیالێن ئالۆز و سۆسرەت دا جووم د بوو •

وێ رۆژێ فێدریکۆ چەند دەم ژمێرا ،ئەوزارکا جوان دانی سەرچۆکێن خوو سەربهوری یێن زۆر ل بویێری وژیهاتی یا باشۆیێ خوەیی خۆشدڤی ژوی را گێرا وە وئەو زێدەترل بەرێ کرە ئەڤینداری جوانی و هونور ڤانییا باشۆ•

مێرێ مۆناژوانایێ چەند سا لا پشتی زەواجێ مربوو ،مۆناژوانا پاشی مرنا مێرێ خو وێ سالێ بۆنا دەرباس کرنا هاڤینێ ، هاتبوو کۆشکا خویە مەزن و ب هەیت وهووت کول وی گوندی دابوو•

ئەڤ کۆشکا راسەری کۆشکا فلۆرانسێ بوو ، گەلەکی جییەکی ئارام وبێ ڤرەوڤرەبوو• دەروازێد وێ یە ئاسنین سەرخیابانەك خۆش وبێنەڤەکەر دا ڤەدبوو، کو ل هەرئالی دا دارێن پالووت ومەرخێ دۆر لێ گرتبوون• ل هەردوو ئالی یێن دەروازێ کۆشکێ دا ، هەیکەلێن خوداییێد رێلی هاتبوون دانان • کانییێد ئاڤێ سارکو هلدکەلیان وسەرچیمەنێن کەسك وشین دا دهەرکین ، گەلی یێ ئارنۆ ژی کول پێشبەرکۆشکێ دابوو ، لاپ ئە ودەراجوانتردکر •

مۆناژوانایا جوان دڤی جی یێ ئارام ودوورکەتیدا ئاکنجی ببوو ، ول درێژایا رۆژێ دا خەریکی تۆرەکرن وپەروەراندنا کورکێ خوەبوو •

گەلەك دەرباس بوو داکوو بەرە بەرە مۆناژوانایێ گۆل ودەردێن خوە بیرڤەکروڤیا خوە شی وشایی یا دەرباس بوویی ل خوە دا سەهکر •

کۆرێ ژوانایێ هەر رۆژ پشتی وێ هندێ کودەمەکی ل سەر چیمەنا ول ژێر سی یا داراندا دڕەڤی ودلەیست ودڤیژیا ول دوو تاووسان دکەت ،بەرب مەژنترین کاروبارێن خویە رۆژا نە دچوو • ئەوژی تەماشا باشۆیێ



جوان بوو کو ل سەرداران را ل هەوا دکەت ودەمەکی ل هەوا چەرخ لێ ددا و پاشێ ل دوو دەنگەکی دوور را ، ژۆردا دچوو ، ل پشت مەرخادا وندا دبوو ·

ئەوی گەلەك جاران ل خو پرسی بوو ، خودانێ ڤی باشۆیی کێیە ؟ گەلەك رۆژان لێ گەرییابووداکو و ل کوتاسی یێ دا ل وێ سپێدا گەرمە هاڤینێ ئەو ل بەر وێ کۆلکا بچووك پەیدا کربوو ·

دەمەك نەبهۆری کوسی یا ترسێ وتاریتی یێ کەتە سەر کۆشکا مەزن وبرجا بلەك وجوانە ژوانایێ · تەدکۆت ڤای زەنگلێ مرنێ تێدا دەنگ ڤەدایەو زنگینا پرکەسەرە وێ کەتییە تەنەبی وتا لارێن وێ کۆشکێ ·

کۆرکێ جوانە مۆناژوانایێ نەخۆش کەتبوو ،هەرر ۆ نەخۆشی یاوی یاسۆسرەت توندتر دبوو ، هێز وجوانی - یاوی رۆژ برۆژکێم وکێمتر دبوو · داییکا سەرلێ شێویایی بدەم هەژمێرا ل رەخ نڤینێ کۆرکێ خوە روودنشت ودگۆتە وی کۆرکێ دەلال تو چ دەخازی؟ بێژە من داکوو بهەرجورمێ هەیی ئەز وێ تشتا کودێ ببە هۆیی خوەشی وهشیانەوەیاتە، ژتەرا ئامادە کەم·

پێشدا کۆرك خوکر دکر وبەرسڤەك نەدداپرسیار- یێ داییکا خۆ· لێ ل کوتاسی یێ دا نەشیا ڤێ سرێ ل سەبەدا سینگێ خوەدا راگرە ، رۆندك ل سەر رووەتاندا باری وبدەنگەکی پر ل لاڤایی وپاریانێ گۆت: دایێ ئەز باشۆیێ فێدریکۆ دخازم ، دلێ من دخازە ئەو باشۆیا یێ من بە·

مۆناژوانا زەندەگرتی ماو بکۆل وکەسەر کەتە بیروهزرێن کوورودوور . هەرچەند کو دزانی هەرداخازا کو ژ فێدریکۆ بکە ، فێدریکۆیێ ژدل وجان ،داخازا وێ بجی بینە ،لێ دەماکو بێوەفاتییا وێ ژفێدریکۆ رادکەتە بیرێ وچاوا ئە و ل دەما نەداری وبەلەنگازی - یێ دا ژ خۆ راڤەتاندبوو ، شەرم دکر هەرسەرا وی ، بتایبەت کو دزانی ئەڤ باشۆیا تنێ دلخوەشی یا فێدریکۆیێ بەلەنگازە·

رۆژ ل رۆژا چوون ، ئەوێ رۆژێ هەجەتەك دئانی ، لێ ل کوتاسی یێ دا دەما کودیت کۆرکێ وی یێ جوان ب وان پۆرێن رەش وقورووشك وب وان چاڤێن کرو جوان ڤایە ل ئاگرێ تایێ دا دسۆژە وبۆنەتی داخازا خۆ هێسرادبارینە ، ل بەرنڤینێ وی چۆك ڤەدا وتپلێد خویە زراڤ وجوان ل حەلەقێد قورووشکە پۆرێ وی داشەکر ،لێڤێن خودانا سەرهنارکێن رووەتێ وی یە کەلژی وگۆت :

کۆرکێ منە جوان ، ئەزێ سبێ بۆناتە هەرم با ل فێدریکۆ وباشۆ ژتەرا بینم ·

لێڤکەنەك بکەدەر لێڤێن کولیلکی یە زارۆکا جندی ژەڤ ڤەکر وپاشێ خەوراچوو ·

سپێدا رۆژا دی تازە تاڤێ ل ناڤ چڤێن دارا و پەلگێن خوناڤ گرتی رادابوو سەرچیمەنێ رێلی ، مۆناژوانایێ ل وێ دەمێدا کو خو خەملاندبوو ، رووبەندەك ئاڤیتە سەرچاڤێ خوو بەرب زەڤییافێدریکۆ رێ کەت · دەما کو مۆناژوانا گەهشتە زەڤی یا فێدریکۆ ،دیت کوفێدریکۆ خەریکی کێلانا زەڤی یێ یە·

فێدریکۆقەت باوەر نەدکر کو ژوانایا بێوەفا و وندا بوویە وی،پاشی چەندك وچەند سا لا دیسا بزڤرە لالی· ژوانال پێشبەر وی راوەستا ، بدەنگەکی بکۆل وکەدەر ، هێدیکا وژمارتی وەهاگۆت :

فێدریکۆیێ دەلال ···· ئەز دۆستانە هاتمە با ل تە ، هیڤیدارم کو تاجیهێ کوژدەست من تێ ، ئەز تۆلا بێوەفاتییاخوەیبهۆری ل هەمبەر تەدا ڤەکم·

فێدریکۆ ،ئەز کو ل رۆژێن خوەشی یاتەدا ، ل هەمبەر تە وئەڤینا تەدا قودە وبێ مننەت بووم ، من داخازو گازی کرنێدتە نەدپەژراند، من پێشکێش و خەلاتێن تە هلنەددا ، ئەز کوحەتانەهە ل شێنیکا* دەرکێ تەرا دەرباس نەبوومە ،ڤێ سپێدی بۆناجەرباند- نا جامێری وهشتاتەیابلندومێرانی ، نەگازی کری و پێ نەحەساندی بوومە مێڤانێ تە، دلێ من دخازە کو ئیرۆ ل بەرسیبەراڤان دارێد جوان دا تێشتێ دگەل تەبخۆم·

فێدریکۆ پێ دەستێ خو خوویا سەرعەنییاخۆ ڤەمالی وب شەرمەزارییەك زۆر ل بەرسڤاوێ دا گۆت:

ژوانا ،سار بوونا تە ل هەمبەرمندا ،هەگەرا نەهێژاتییامن بوو ، نەژقودەتی وبێوەفاتی یاتە بوو · ئەگەر ل هەبوونامندا پرتییەك باشی وقەنجی ژی هەبە ، ئەز وێ یا ژی ل تەدزانم· ئەڤ دلۆڤانییا تەیاڤێ کوتاسی یێ تۆلا گشتی کۆل وکەدەروخازیکێن منە بهۆری ڤەدکە·

پشتی قاسمکی فیّدریکۆ میّڤاناخۆل ناڤگولیّن مەریەم وکەوکەبە رەخ باغ داروونشتاندن وبەرب کۆلکیّ چوو داکوو تیّشتەکی ژیّرا ئامادەکە.

ل ریّ دا کەتەبیرامەزناتی وهەیی یاخۆیە چوویی و کاسك وپیالیّد زیّرِوزیڤ و شەرابیّد سۆرەئەقیقەیی . گاڤا گەهشتە کولکیّ گشتی قەفەسەوتاقچەورەفیّن کۆلکیّ گەرِییا وتشتەك پەیدانەکر، گازی بەردەستکیّ خویە پیر "پی ییّر" کر:

پی ییّرگوت : بەگ ئیرۆ مە نیّچیرنەکرییەوژبل نانیّ کارتۆ وشەرابیّ چ ل مالدا چنەیە.

نشکیّڤدا باشۆییّ خەولیّکەتی زەنگلیّ کچکەیە ئوستی ییّ خۆهەژاند ودەنگا زەنگل کەت. تەدگۆت قای بچاڤیّن خۆدگۆتە فیّدریکۆ ئەگەر تشتەك ل مالدانەمایە، ئەزئامادەمە.

فیّدریکۆ نشکیّدا بدیتناوی قووژیا :

ئاها ئەی باشۆییّ منی بویّر! مەزناتی وەوا فرِقازیّن تەودەنگیّ زەنگلیّ تەوبەندۆبازیّن تەیە جوان، رەڤ وهەلبەز ودابەز ونیّچیریّن تە ل ناڤ میّرگ وزەڤی وبشی وجەنگەلاندا ئیّدی بۆهەمیشە کوتابوو. ئەی باشۆییّ بویّر تارۆژائیرۆ تونیّچیرڤان بووی، ئیرۆببەنیّچیر. ئیجا فیّدریکۆ سفرکەك سپی ل سەر ماسە راخست ول دەورییەك دارین دانان هانی وهندەك تری ییّد ئەرخەوانی کوهیّ ژی لبەر تیریّژ ییّن تاڤا پاییزی گەرم بوون ،دانی رەخ ویّ. هندەك هلوویّن گولاڤین وهرمی ییّن زەرین ژی دانا رەخ وان . ل نیڤەکاواندا ژی شووشەیەك شەراب دانی سەرماسە وپیّ گولیّن پاییزی دۆروبەریّ وان خەملاند. ل ناڤ وانا هەموویّ داخارمکەك کول گۆشتیّ باشۆییّ بویّر چیّکربوون دهاتە خوویان.

بەردەستکیّ فیّدریکۆ "پی ییّر" دەماکو ب کول وکەدەر ل کۆلکیّ دەردکەت بەرلیّڤا خوەدا گۆت: هەی بەگ .... گەلۆ ئەڤ هەموو خارنانە گۆشتیّ باشۆ تیّ نەبا، تیّراتە نەدکر؟!

دەماکوسفرك ئامادەبوو ،ژوانا دگەل فیّدریکۆ هاتن هوندورکۆلکیّ. فیّدریکۆ ئوسا گولشاوکەیف خۆش بوو کونزانی چ دکە وچ دبیّژە .

دەماکو تاشتیّ کوتابوو ،ژوانارابوو و دگەل



فیّدریکۆ ل کۆلکیّ دەرکەت ئەواناگەل هەڤ ب پیاسە بەرب زەڤی ییّ چوون. هینگا ژوانایێ پیّ پەیڤیّد ییّ سەروبەر وشیّویایی وەها گۆت:

فیّدریکۆ ئەز دزانم کومن پیّشدا باش دگەل تە دەرباس نەکرییە وحەقیّ تەهەیە کوتو ژهاتنامنەئیر ۆ زەندەگرتی بمینی. لیّ تەزارۆك چنەیە ونزانی و نکاری دەمادایکا کوزاراویّ نەخۆش وبەدحالبینی پیّش چاڤیّ خووبزانی کاد چ دەردوگیرۆداریەکیّ دایە وبیّ رزگاری یا زارکاخوە چاواتیّ دکۆشەو ئامادەیە هەر جۆرە زەحمەت وئیّشیانان بپەژرینە.

ئەڤەیە کومن نەهە شەرم وحەیا وقودەتی یاخویە ژنانە لادایە وهاتمە لالی تە وداخازیّ ژتەدکەم کو باشۆییّ خو، هەرچەند دزانم کو ل دونیاییّ دا ژتە را ل هەر تشتی خۆشدڤیترە وتول هەرتشتی زیّدەتر حە ژی دکییّ، تنیّ دلخوەشی یاتە ب وی یە ،بدی کورکیّ من. ئەگەر توڤیّ داخازامن بپەژرینی دڤەوەمکو کورکیّ منی بەلەنگاز زندی بمینە ، یان ناچ هیڤی یا ماییڤا وی نەمایە وجانیّ وی ل خەتەریّ دایە.

فیّدریکۆ هەرئوسا کوگوهداری دکر هیّسریّن خازیك ومخابنی ییّ ل چاڤیّن وی زۆردا دهاتن .

- حەیف وموخابن ژوانایا دەلال، ل دریّژایا ژینیّ دا چ خوەشی یەك ژمرا زیّدەتر ل ویّ هندیّ نەبوو کو تو داخازەکی ژمن بکی وئەز ئەویّ داخازاتەجیبجی بکم. ئەگەرمن دەم ژمیّرەکی پیّش نەهە دا داخازاتە بزانبیا من دشیا داخازاتە بقەداندا، لیّ من خۆشدڤی ترین مالیّ خوەل دونیاییّ دائیرۆ ل بەرپیّ تەگۆری کر. باشۆییّ منی بویّر سەرژیّ بووکو تیّشتامە یائیرۆ تەکووزبە.

# بیرانینەک

## «ژ دیوانا دایکا گورگین»

سەبری بۆتانی .

پاشماوەی یاشۆ

ژوانایا جوان چاڤێن خوه هێدیکالێ زڤراند ، ئەوێ نەدکاری بێ هیڤی تی یا خوه چاوادیارکە٠ ل هاتنا خوه شەرم دکر ونزانی کوفێدریکۆچماگەرەکە تشتەکی وەهامەزن و گرانبهال رێکا ژنەك وسان نەدلۆڤاندا گۆری کە٠ خاترێ خولێ خاست و ب چاڤێن شل ودلێ کۆل وپێنگاڤێن سست وگران لنا ڤ زەڤی یا وی دەرکەت٠

سێ رۆژا پشتی ڤێ قەومینێ ،نشکاڤا دەنگێ زەنگا مرنێ ل دێرابچووکە رەخ وان بلندبوو،فێدریکۆ گوهێ خوه دادەنگێ زەنگێ وبەرلێڤاخوەداگوت : گۆرێ وێ یە دەهسالی مر٠

فێدریکۆ ل پشت پەنجەرا کۆلکا خودیناخو دداخیاباناگوند یادوور وتێداژن ومێرێن رەشپۆش کوبۆنا مرناگۆرێ ژوانایێ هێدیکا پێشدا دچوون ، ددیت و هێسرێن مخابنی وخازیکا ل چاڤێن وی دهەرکین و بەرخوەدا دگوت :

حەیف ، ئەگەرمن لەز نەکرابا، دقەومی ئوها نەبا٠

ئەگەر مرۆڤ هندەکی سەبرێ بکە وبەر خوبدە ، بێگوتن دێ بگیژە گشتی مرازو داخازێن خوه٠

ئەڤرۆ ١٦ایێ گولانا ١٩٦٦ ێ یە وسعەت ژی یازدە وبیستە٠٠٠٠٠ ویێهە قەشە پۆلسێ بێدار ی ل هەسپەکی سوارە وهێدی هێدی تێت ، ژکۆلۆسێ سەرێ وی تاپێلاڤالنگێ وی٠ وەك رەنگێ هەسپێ وی رەشە٠٠ زەلامەك ژی هێدی هێدی ل بەراهی یاهەسپێ وی تێت ودسترێ٠٠٠ ڤایە گەهشت وب ئالیکاری یاوی زەلامی ژهەسپێ خوه دابەزی ٠٠٠سێ کەس ،کوئێك ژوان چەندێ توبێژی ،قەرس ونەقاییل وزمان درێژە ل سەرلێڤا جۆکا ئاڤێ روونشتی بوون٠ رابوون سەرخوه و قەشەژی سلاڤ دا ، ئوکەیف خوەشی یاخوەژی بۆ وان دیارکر ، وان ژی سلاڤ وهاتنا وی ژدل پیرۆز کرن ٠٠٠ قەشە روونشت وئەوژی روونشتن ٠٠ قەشە ژبەریکاخوە دەڤێ هەریەکێ ژوان ب شەکرۆکەکێ شیرین کر٠٠٠٠ گول وکولیلکێن هەزار رەنگ ب نازی ودەلالی یاخوە ، ئەڤ چەمك وبن چیاسەرانسەر خەملاندینە ،ب بایێ رەدرەقسن وب مێشێن هنگڤینی و چێیکان رەدکەنن ، چاڤ ودل ژێ تێرنابن ٠٠٠ڤێ خەملاسپەهی دلێ مام قەشە ڤەکر و ستراند( بەرچەم بەرچەم دچۆماهەی لێ لێ ، هەی لۆلۆ ٠٠٠) سترانا خوه هەوکروگوت : ببینن ، ڤان کولیلکان ببینن ،بڕێننێ چاواب هەڤالتی و یەکبوونا خوه ڤی جی خوەش دکن٠ چ خەملك تێرنەخش ونیگارچێ دکن٠٠٠ چ هونەرەك سپەهی پێشکێش دکن٠٠ لەودبێژن: گولەك تەنێ ناکی بهار ،ماچیە گەلۆئەگەر ئەم مرۆڤ ژی وەك ڤان کولیلکان ببنە یەك ؟٠٠خوه ز ی یەکبوونامە ژی وەك یاڤان کولیلکان بوویا ٠٠نزانم چماعەم ژتشتەك هوسافێرنابن٠

نەقاییلێ زمان درێژ سەرێ خوه ئێ رەق وهشك ل قەشە هەژاند وگوت : توب ڤان گۆتنێن ڤا لاکێ دخاپینی مام قەشە ؟٠٠٠تو مەیێ دخاپینی ئان ژی خوه ؟ ٠٠ ، گە روەك ئەزدبینم من بگۆتا ، پێش توبێژی ،تەژی ئەڤ پەسنێ هیچ وقەلەو نەددا ٠٠٠ باسێ خەباتێ تو بکە ، بهارا رووەت وکەیفێ نەیاپەسن وفەلسەفێ،نان وخویبوون مە دڤێتن ، ئەم دێ چ کن ژ فەلسەفێ ، هەی قەشە یێ تێرو تژی ٠"

چریسەتێ قەشە گرت ، عەجێب گرتی ما ،دیت ژی کو گۆتناڤی ویاوی هەردوك ژی ، هەریەکێ ژرەخێ خوه ڤەراستە ویاوی ماك وهیمە ،لێ یائێ زمان درێژ ی

سەرێ و ێ هەیە وبنێ وێ نەدیارە ،ئو شرۆڤــــە ژی دڤێت هەم ژی یارۆب گەف ومهانەیە ، نەكو هەڤ رسو ا بكن... قەشە كو هوسادیت ،حەز نەكر گیژاهی یــــێ ژخوە رەچێكی ، خوە نەئانی رێزاوی ، خوە سـل ژ ی نەكر وب نەرمی گۆتێ : دەكائەم دەڤ ژڤێ فەلسـەفاكـو ئەڤ هەسپێ من ژێ بەردن لۆۆڤ ، ئەزدێ پرســەكــێ ژتە كـم.

– مادەم من تو راوەستاندی ، بێژە ، ژتە پرس و ژ من بەرسڤاراست.

– دیتناوێ پیرا پیرۆزو بێ كەس و وارژ من رەببوویە كۆل وكەسەر ، ئەز شەیدایێ ئاخاڤتناوێ مە، خــوەز ی هێژ ئەز نەمریم جارەك دی من ئەو پیرا زیرەك بدیتا ، ئێدی بەس .

– پیـرابدلیسـی ؟..

– ئەرێ ب خودێ ئەو ، نەكەسەك دن.

– ئێك ئەو ، ئێك ژی تو هوون هەردو وەك هـــە ڤ حەژ تەڤزوتنازا دكن وەك هەڤ قۆچەبازن ژی ،لەوتـــو

هند خۆزی خوازێ دیتناوێ بەرازا پیرۆزی...مەلایــێ "شێوەلۆكێ " وێ دێهلا شەقلەباز دناسی ، دگــــــۆ كوشتناوێ تافی یە – حەلالە – لێ باوەركە مام قەشـــە ئەز خوە ژی وەك تەمنێكارێ جڤاتاوێ و ئاشــقـــــێ بهیستنا دەنگێ وێ مە هەردپرسم ژێ ، لێ من كەسەك نەدیت سالوخەكێ ژێ هلدی ئان تشتەكێ ژێ بزانی... ئاخ پازێرەكە ئەوپیرەژن ... دەبێژن دجوانی یاخـــوە دەخاپزانەك مەزن و ئاشق خۆربوو ، خوونایارێن خــوە ڤەدخوار ... دبێژن نـهۆژی وەك دووپشكە و كەس نەشێتێ ل خوە هشیـار بەمام قەشە .

ئاخركی قەشە ناچاربوو ، رابووسەرخوە وگـــازی زەلامێ دگەل خوە كر : "سلێمانۆ"، هەسپێ مــــن بینە من دەراقەتا ڤی زمان درێژی نینە ، وی بـــاوەر ی ب گۆتنێن خوەژی نینە ، داخوازاوی بهارا زك وبـــن زكـە ......

ژ ١٦اێ گولانا ١٩٦٦ ێ داكەڤن وەرن ١٨اێ تیرمەهـا ١٩٦٩اێ ....دەراڤەك تەنگ پیرابێ كەس ئاژۆت ... ئانی –– ئانی بەر دفنا مام قەشە دانی... ئــــــەو بێ شۆلێ زمان درێژ ، ئەوژی وێ گاڤێ وەك جنەكـــــی پەیدا بوو ، گۆتێ : چ توب سەرمە دەراتەقاندی ؟هـە ی پیرا خودێ ژی ستاندی...چ توژوێ دەشتێ ئانی ڤـــێ " دوزەخبەهشتێ "؟ هەی خودێ نەهشتی...ترسێ ئان برسێ توئانی هەی خودێ كوشتی ، ئان چاخێ گونێلا – تەیە وبایێ وێ توراتەقاندی ب سەرمەدە ؟..دەئێجـــا بمـرە مانە بەسە ؟"

پیرێ تف كرێ وگۆت : بایەك رەش ئەز فرانـــدم ، ئانیم –ئانیم بەردەستێ هیچ و پووچەك وەك تە دانیــم هەی كۆرێ وێ ماكەرێ "

ئەوپیرا ١٠٠ – ١٠٥ سالی وئەوقەشەیێ ٨٠– ٨٤ – سالی دیسان وەك دونەهەنگان ل هەڤ روونشتـــــن و دەڤ پێ كرن .. ژ لالش راهێلانێ ، تادێرائەختومالێ، ژ زاگرۆز و شارەزۆر هەتاشام وشەنگالێ... ژچین و ماچینا هەتا چیایێ مەتینا ... ژكراسێ زطیخێ هەتا هەیڤ ومەریخێ ... ژ كەنیشتێ تادێرێ ، ژدێـــــر ێ تا مزگەفتێ...ژ بائەدرا شێخادی تابەردەرێ بەهەشتێ ... بەر وئاڤ و جوگرافی ، هن خوەش وهن كـــەرافی.. چ چیرۆك وچیڤانۆك ،چ ژی هونەر ودیرۆك ،تشتـــەك

نەمانە گۆتن ·

هەرچەند هەردو ژی - قەشە وپیرێ تێرا خوەبیرتیژ و تێگە هشتی بوون ، لێ پیرێ ژوی زیرەکتربوو ، کوقەشە ژپیرێ دپرسی ، پیرێ بەرسڤ ددا ، لێ هنەك ژ پرسێن وێ ژ قەشە بێ بەرسڤ دما · پیرێ وەك چاواپێش هنگێ‌شیابوویێ ڤێ جارێ ژی شیایێ ··· قەشەیچەکێ شەرم دکر چکو هەرجار پیرێ ژوی دبر ، لێ وسازی چارژ خوە نەدکر وچەند شیابایان دەلیڤ هەبا دچۆ جەم ··· نەمازە ژێ‌رەبوو بووکەسەر کوهەماجارەکێ ئەوژی زۆرا پیرێ ببی ··· لێ یاراست ئەوە کو ئەم بێژن : تێگە هشتنا پیرێ ئەوبال پیرێ ڤەرادکشاند ، پیرێ ژی ئەڤ لەوشکەستنا قەشەلێ تال بوو بوو ،لێ بناسێ وی بوو ،نەیێ وێ ، وی دەڤ دهاڤیتایێ و دەرگەهێ گەنگەشێ لەبەر ڤەدکر ··· جارا پاشی یێ ، کو ئێدی هەڤ نابینن ، قەشە ب نیازا تۆلەستاندنێ هاتێ ، پیرێ گۆتێ : ڤیرازی یامن ئێدی وەك بەرێ ل من خوەش نایێ "· لێ قەشە بەلا خوەژێ ڤەکر و گۆت :

پیری پیرێ رەبەن دێرامنێ
شەڤ ورۆژێ ، هەرل بیرامنی
زانینامن تەنینە ، ژنکۆکێ
زانا ئەزم هەی نەفێرامنێ

پیرێ بیستەکی خوە ل مام قەشە بێ دەنگ کر وپاشێ گۆت : های ژ خوە هەبە ، خوە شاش مەکە هەی کەشیێ خودێ ژێ ستاندی·· کەسێ‌زانا پەسنێ خوە نادی ، هەی ئەز گۆری تەو وی خا چاسەرسینگێ تەبوویەۆ ، ئەڤ گۆت ورابوو چۆ گۆزکێ ئاڤێ ژڤادێ راکر وتا خەمێ درانێن خوە ژ دەڤێ خوە دەرانی وپێ شوشت وتێرئاڤ ژێ ڤەخوار وتا خەمێ درانێن خوە دیسان ڤەگەراندە دشەکەفتا دەڤێ خوە کەوچەند جارەکان دەڤێ خوە ڤەکر و مچاند وتلی یا خوە باشەهدێ ل قەشە هەژاند ، ئەڤ دینا مێت پێڤە پەقاند :

ئەی کەشیێ بێ مال ودێر
شێرهەر شێرە چ مێ ،چ نێر
چەندا ، بکی ، چەندا بێژی
هەر ئەز ل ژۆرم تول ژێر

قەشە گۆت :

ژن هەر ژنە ، چ ژۆر چ ژێر
کەس قەت نەدیت ژن بوویە مێر
ڤاژی نەکە شۆلا خودێ
هەی پیرا نەزان وبێ خێر

پیرێ گۆت :

گوه بدێرە گۆتنامن کەڤنە پیرێ
نەرەبەنامزگەفتێ مە ،نەیادێرێ
هلۆ رابەژمەیدانێ ئان تشتەکێ
بێژە کوژێ دیاربی نیشانا خێرێ

قەشە پلەمێ خوەکر ،لێ زوو خوە چێکرڤە وزڤری سەر هەمدێ بەرێ··· پیرێ ب نازکی پەشیمانی یاخوە دیارکر ، لێ مام قەشە خوە ژبەرێ سلترکروئەنی یا خوە کر گرێك و گۆت: " ئەزدێ ژکێ وژچ خوە سلکم هەی گەرۆکادنیا شەقاندی·

پیرێ کو دیت قەشە خوە ترش و گەمۆرکر ، وی ژ ی خوە ئەرناند وگۆت :" ب ناهەق تە خوە سلکر ومن ژی ب ناهەق ژبۆ دلێ تەی ژ رەنگێ جلێن تە ، خوە پەشیمان کر ، لێ مخابن توب خوەڤە نەچوویی·

قەشە دەنگ نەکر وپیرێ گۆتنا خوە ئاژۆت: " گەر دپرسی توژپیرا بدلیسی ، ترانا مەکە ،لێ کو تەکر ، خوە سل مەکە ، ئەزب کوردی ،نەب ترکی دبێژم : ئەو پیرا هەزار کەنکەنە وگرگرە حیزکرین ، تو نەشێی وێ چیزبکی "

قەشە شەرم وئەرناخوە ڤەشارت و گۆت :

هەی ماشەللا هەی ماشەللا
کەسەك نەشێ قەشێ فەلا
توهلۆ رابەژمەیدانێ
هەرصبینە شێخ و مەلا

پیرێ خوەکەناند وگۆت: " هائەڤێ ژی ببهیسە و زمەترانێ خوەرەبێژە·

گۆتنا کەشە گەلاشە
خەلقۆمرن تەماشە
ئەزدایکا "گورگین"م
من کەشە کرشەماشە

قەشە رابووسەرخوە وگۆت: ژ دەستوورا پێرێ ئەز دێ چم··· پیرێ ب لەز جبەیێ وی گرت وب دەنگەکی تژی قەدر گۆتی: مەچە ، مەچە ، دانیشە ئەم خوە ژ



هەڤ خێش کن ، پاشێ هەڕە و ئێدی هەو وەرە ،چکـــو ئەگەر تو وەری ژی تو من نابینی. ب نەرمی وسپەهی گۆتێ :

- ئەز ژدیواناتە تێرتابم ،لێ ئەزب شۆلم نەشێم تەچم ونەشێم نەیێم ژی هەی پیرا کۆل ودەردا ... هە ی ماك ودایکا هەمی کوردا ،ئەڤ گۆتنا قەشە پڕ ل پیر ێ خوەش هات وب کەیف و ژدل گۆتێ :

- های* ژدەڤێ خوە هەبەها ، پیراگەڕۆك مەکەڤڕۆك، جارەك دن ڤێ گۆتنێ نەبێژە ، هەکەنائەز دێ بفرم . "

پیرێ داوا جبەیێ قەشە بەرنەدا وب کوتەکی روونشتاند وگۆت :

کەسێ منۆ ، کەشێ منۆ

نەزان وکێف خوەشێ منۆ

مامکێ منۆ ، خالکێ منۆ

تشتەکی من ژتشتانە

راسەر زۆزان ودەشتانە

گوڕ گوڕدکی بێ ئەزمانە

تێ ودچی بێ لنگە

گورمینە دنگە دنگە

تێر رۆندك وبێ چاڤە

نۆلا هەڤریشمێ خاڤە*

- بێ راوەستان قەشە گۆت :( هەورە) گوڕگوڕدکی ، کو بارانێ دبارینی(رۆندکن )، دنگە دنگ ژی تەقرەقا بەرق و برووسکانە ، ئەڤە من توگرتی. دەکاڤێ جار ێ زیرەك بەوڤێ یامن بزانە. :

- هەکە توبیبینی ، ل خوەناکی ، هەکە ل تەکن ئێدی نابینی.

کوتکوتادلێ مام قەشەیە ،نەکو پیرێ بزانێ چ یە..

پیرێ بێهنەکی هزرا خوە تێدەکر وگۆت: - ب خود ێ. کەکەشە یۆمن نەزانی وئەزنزانم " قەشە خوە تێرکەناند وگۆت: - کەڤنە ،کەڤنێ تەی پیرۆزە ، تەدیت چاوامن توگرتی وکوشتی ، دەتو بزانێ ئەز ئەزم.

قەشە ب کەیف رابووبچی وپیرێ ژی بەرسڤەك تیژ دسەرێ خوە دە حازر دکر کو بەلکی کەڤنێ پیرۆزپێ بدرینی ودلێ قەشە ژی پێ ب ئێشینی ، لێ قەشە دەلیڤ نەدایێ وژ نشکاڤە ئەڤ پرس وبەرسڤێن هێچ و هێژاژوان پەیدابوو.

قەشە : تەدیت ؟

پیرێ : مدیت

قەشە : تە چ دیت ؟

پیرێ: م ئەودیت

قەشە : ئەوچ یە ؟

پیرێ : ئەو ئەوە

قەشە : م زانی

پیرێ: تە چ زانی ؟

قەشە : م ئەوزانی

پیرێ: ئەوچ یە؟

قەشە : ئەو ئەوە

پیرێ : وەی تر

قەشە: وای وای

پیرێ : های های

قەشە : بای بای پیرێ

پیرێ : کش کش کەشە

# فەرهەنگۆک



**ئاورلێ بوونەوە:** تووڕەبوون•فلانــە کەس هــەرئاوری لـێ دەبێتــەوە( زۆر تووڕەیە)•

**ئۆرتە:** نیڤەك ، نیـوان •

**ئیدیۆم:** (اصطلاح) زاراوە•

**بەندوباز:** تەول وباز ، فەتل وتـــاو خوارەپێچەکە•

**پنگەلانە:** تێکەڵ وپێکەڵ : شـاش و فـش•

**پەلەگوە:** بنانگوێ ،بنەگوە

**تەقز:** تەوس وتانە ، تەنز

**تنگ:** شێنــە ،نەمـام

**تێك ترینجاندن:** دەبەریـــــــە ك راکردن• وەبەریەکدان•

**جەخت:** یەقین • متمانە•

**جطلە:** (صف) ریزی بالندە•شتێکـی جۆنراوە وەك گوریس•

**جگر:** رەقیب ، خەنیم•

**چڤیك:** جوونجك ،جووجـــــك ، چیڤك ، چۆلەکە•

**خیش کرن( بوون):** داش بــەداش ، هیچ لەهیچ•

**رەپاڵ نان:** راونان• بەهــەڕەمـــە وەدەرنـان • دەرکردن•

**رەوغەن سووزی:** (روغن ســـوزی) - سووتانی رۆن لە گەڵ بێنزیـــــن دەماشێنـدا کەنیشانەی خـــراپ بوونی موتۆڕە•

**رشقەن:** (ریشخند)• بەکــەسێـــك پێکەنین• گاڵتە پێکردن•

**زیندوولە:** زیندەوەری زۆر وردو - چکۆلە کەدەبێ بەمیکرۆسکـــۆپ ببینـدرێ •

**سالوخ :** سالغ ، هەواڵی سلامەتی•

**سەربووری :** بەســـــدرهـــات ، سەرگوزەشت •

**سۆغرەگرتن:** بێکارپێکردن•

**شێلگیر :** (جدی) مکوڕ •لەسەرکـــا ر پێداگر بوون•

**شێنیك:** ئاستانە •

**فرقاز:** پەروازی قازانە•هەلڤڕینـــی لەپڕ•

**فێز:** لای سەرێ - سەروو

**ڤەجنقین:** سلکین ، هلپەکیـان ، سڵەمینـەوە•

**قەرسیل:** لاسك وگەلای گەنم وجـۆ • کلـــۆش•

**قصیدوقوچـان :** پاوان،خاوەنەتی • (مالکیت )•

**قورووشك:** بەکرووزۆك• پێچ پێچ • فرفری•

**قروقر:** قەرەبالغ - پرحەشامەت•

**کارتۆ:** بەیات (نان) ماوەوە•کـۆن (خواردەمەنی)

**کلك وتوور :** خزم وکەس وکار •

**کلکە لەقە:** حاڵەتی کەوتن وبەزین ، نەخۆشی وکەساسی•

**کلووپ:** کـۆڕ • باشگـا •

**گوون :** دەوران•

**ماکە:** (عنصر - مادەاصلی) شتـــی بنچینەیی•

**مەرخ :** داری سـەرو ،

**مێزەکـرن :** لـێ روانیـن •

**نۆلا :** وەك

**های:** ئاگا

**هەست:** سەه ،سەح•(احساس)

**هسیانەوە:** ڤەهسیان،حەسانـــەوە - پشوودان•

**هەیکەل:** پەیکەرە، موجەسەمە•

**هۆکار :** هۆ، بنۆس •





فەرهاد یاری ـ گیلان غەرب

عەبدولقادر گوە پەیما ـ پیرانشار






جەماڵ کوڵ ـ مەهاباد



خالید عەزیزی ـ پیرانشار



ابوبکر ابراهیم ـ نیگار ـ اربیل